ئە ونە دڵسەردم لەتان وپۆی وجوودم،چون خەیاڵ

پڕتەوی ئە ستێرە ئەتوانێ بسووتێنێ لەشم

عیشقی دڵ قاییم لە نێوکۆشکی بلوورا ناکرێ

بۆنی زەخمی تازە بەرزە،هەروە کووخوێنی گەشم

# چاوی خوێنینی شەوەق

○ شیعر:عومەری سالْحی ساحێب (کۆلیل)

○ ئامادە کردن:سەیدعەبدوڵلای سەمەدی

○ بڵاوکردنەوە:(کۆلیل)وعەبدولباستی کوڕی

○ چاپی هەوەڵ:۱۹۹۹/۱۳۷۸

○ تیراژ:۳۰۰۰دانە

○ پیت چنی:ئاویەر(سنە)

○ ڕێکخستنی لاپەڕەکان:ئەییوب گەنجی

○ تەرحی رووبەرگ:سەیدعەبدوڵلای سەمەدی

○ ژمارەی ئیزن ورەزامەندیوەزارەتی ئیرشادی ئیسلامی

۱۳٤-۱/۱۷٤
۷۸/٤/۱۵

○ چاپخانە:چیهری(تەورێز)



تلفن وآدرس پخش ۲۶۵۷۹ سقز

قیمت ▬ تومان

# پێرست

تۆپی ئەستێرە بێ وشە
لە پێشکەی ئاسمانی شینا
بۆ هۆنراوەم دەشنێتەوە
لە سەر مەوجی پێکەنینا

## پێشەکی

هەموو سەرلەبەهاران زەوی بۆش دەبێتەوە و دەنک و چەکەرەی لەژمارنەهاتوو دەکەونەخۆ ,
دەست لە خاک دێننە دەر و ئاماژەی هەتاو دەکەن. دڵی زەوی وەکوتان دەکەوێتەوە و دار وەهەناس
دەکەون. سروشت بێدەنگی زستان دەشکێنێ و دۆڵی کپ و چیای بێدەنگ بە هاژە و قەڵبەزەی
جۆگە و شۆلاوکەی ئاو سروودی ژیان تێهەڵدەکەنەوە. وەی کە چەند لە یەک نزیکن ژیانی ئێمە و
خاک! چەند لە یەک نزیکن ژیانی ئێمە و ئاو! وەی کە چەند لە یەکدەچن ژیانی ئێمە و چیا
بەسەرهاتی ئێمە و سروشت!

لە کاتێکا چیا دەسووتێ، دۆڵەکان ئاهەنگی شایی دەگێرن و نایەڵن رەورەوەی ژیان بوەستێ، و
کاتێک دۆڵەکان بەسەریەکا دەتەپن، دارستان گەری رەشبەڵەک دەگێرێ و چەرخی ژیان دەخاتەو،
گەر و ئەو دەمەی دارستان سەردەبڕن، دڵی زەوی دەهەژێ و میلیۆنەها پرزۆڵەی بە رواڵەت بێدەنگ
پیلانی ژیانێکی نوێ دادەرێژن و خەونی دارستانێکی دی دەروێنن. وەی کە چ رادە لەیەکدەچن
ژیانی ئێمە و دار! بەسەرهاتی ئێمە و دارستان!

لە هەموو باخچەیەکی دەور بە پەرژین تەنراو، چی دەروێ، باغەوانێکی پسپۆر بە دەوریدا دێ:
بەر پێی بژار دەکا و بە هەرەس و کوود و ئاو هێزی وەبەر دەنێ و موتوربەی دەکا و دەستی دەگرێ و
پێی پێهەڵدەگرێ. بەڵام من روەکێکی بێپەرژین لە هەوارێکی تەماوییا دەناسم کە لە ئاوی باران
دەخواتەوە. لەگەڵ بژار دەخەبتێ. لە ئاستی سەرما و گەرما و مڵۆزم و شەختەدا دەجەنگێ. لە
بەرامبەر گژەبا و تۆفانا چنگی لە زەوی دادەگرێ. بەسەر پێوە رادەوەستێ و ناکەوێ. پایزان لە دوای

ەموو روەکێک دەنوێ و بەهاران بەر لە هەموان چاوی هەڵدێنێ. کە سەیری دەکەی، موتوربە
ڕاوە بە بێباغەوان، بژار کراوە بە بێدڵسۆژ، کوودی دراوە لە گەڵای وەریوی خۆی و ئاو دراوە بە
ەونمی فرمێسکی خۆی. لە سەر پێی خۆی راوەستاوە و ئاماژەی هەتاو دەکا. تەنانەت چەند
ێلانەی خنجیلانەی هەندێ پەلەوەری بچووکیشی لە ئامێزی لک و پۆ گرتووە و بەخێویان
ەکات ...

**چاوی خوێنینی شەوەق پێنجەمین بەرهەمی چاپکراوی مامۆستا مەلا عومەری ساڵحی
کۆلیل»ە، کە دیوانی شیعرەکانیەتی و قسەی دڵی خۆی. ئەم دیوانە سەرجەم هۆنراوەکانی ساڵانی
١٣٤ هەتا ٧٥ی گرتووەتەخۆکە بە پێی شێواز و پەیام لە سێ بەشی جیاوازدا رێکخراون. بەشی هەوەڵ
،و شیعرانەن کە سەرچاوەیان تەنیا هەست و سۆزی شاعیر خۆیەتی. بەشی دووهەم شیعری بۆنە و
ڕناسەبەتن، کە وایە لە لاوە دەکەونە نێو رووباری ئەم هەستەوە. بەشی سێهەم کە جیاوازیەکی
،واویان هەیە لە گەڵ دوو بەشەکەی پێشوودا، ئەم شیعرە تازانەن کە دەکەونە دوایین کارەکانی شاعیر.
یاوازی ئەم بەشە شتێکی ئاسایی و سروشتییە، چونکە شاعیر لە گەڵ چاخ و زەماندا دەرواتە پێش و ئەم
ڵوگۆڕەی زەمان پێکی دێنێ، شوێن دەخاتە سەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی هونەر بە گشتی. کە وایە
،گەر شاعیر بیست ساڵ و سی ساڵ لەمەبەر بە شێوەی دوو بەیتی و پێنج خشتەکی و مولەممەع شیعری
وتووە، دوایین شیعرەکانی شێوازێکی نوێ و گونجاو لە گەڵ رەوتی ئەمڕۆیان بە خۆوە گرتووە و لە
ەموو روانگەیەکەوە بە زمانی ئەمڕۆ دەدوێن. لەوەوە دەردەکەوێ «کولیل» لە جەغزێکی بەستراودا
ەڵنەسووڕاوە، بەڵکوو لە سەر رێبازێکی دروست هەنگاوی ناوە، جاگەیشتێتە هەرکوێ و چەندی لەم
ێگایە بڕیبێ، گرینگ ئەوەیە کە وەها رێگایەکی بڕیوە.**

**مرۆی خاوەن ئامانج لە هەر مەنزڵێکیشا بۆ سانەوە دابەزێ و پاشان بە جێی بێڵی و مەنزڵ بگۆڕێ،
یسان هەر لە ئامانج نزیک بووەتەوە و هەتڵە نەبووە. بۆیە ناوەرۆکی پڕ و کاکڵی جوان لە هەرسێک
،شی هۆنراوەکانیدا هەن و گەلێک لەم سەدەفانە کە بیشکنی، گەوهەری نایابی تێدا دەبینییەوە. تەنانەت**

له شیعره بۆنه کانی ئەم دیوانەشدا دەبینی شیعره که دەقاودەق بۆ فڵانه کەس یا فیساره کارەسات نه گوتراوه، بەڵکوو ئەو کەسه یا ئەو کارەساته کراوەته دەسمایەی مەبەستێکی تر و تای تەرازووی به لایەنێکی گرینگتردا قورس بووه که رووداوه کەی لێبووەته بەهانه. بۆ نمونه ؛کاتێک شیعرێک به بۆنەی مانگگیرانەوه دادەنێ، تەنیا لەم سووژەیه کەڵک وەردەگرێ و قسەیەکی دی دادەمەزرێنێ و بەرهەمێکی تری لێوەدەست دێنێ :

باکوو هەرکەچ بێ لەگەڵما زەمان — بمچەوسێنێتۆ هەر وەکوو کەوان
شەرەفم نادەم به سوفرەی رەنگین — رازیم به دەستی خاڵی و لەتێ نان
تا رۆژێ دەردێم له ژێر خاک و خۆڵ — چەشنی ئەو مانگەی گیراوه ئەلعان

تەنانەت لەکاتێکاکه قەرزی کەسێکی له سەر بووه و خاوەن قەرز داوای پارە کەی لێکردووەتەوه، ئەم بۆنەیەی کردووەته هەوێنی باسێکی تەواوکۆمەڵایەتی و پەنجەی له سەرگەلێک لاری و ناتەواوی داناوه و هێمای گەلێ نارێکی وکەند وکۆسپی کۆمەڵایەتی کردووه و له راستیدا وەک ئاوێنەیەک دەرد و ناسۆره کانی کۆمەڵی خۆمانی نواندووه.

کەڵک وەرگرتن له بۆنەیەکی زۆر ئاسایی وکەم بایەخ بۆ مەبەستێکی قورس و بنەڕەتی، تای ناوەرۆکی ئەم بەشه له شیعره کانی قورس کردووه و له چوارچێوەی تەنگەبەری بۆنەی رزگارکردووه. به کورتی شاعیر له شیعری بۆنەدا، که پلەیەکی نزمی شیعره، به پشتیوانی بیر و باوەڕ و ئامانج شیعره کەی هەڵکێشاوەو له پلەیەکی ژوورتری داناوه. له بەشی دووهەمی ئەم دیوانەداکەم شیعری بۆنه هەیەکه شاعیر بۆلایەکی تری نەبردبێتەوه و بەرهەمێکی تری لێوەدەست نەهێنابێ. له پارچەی « خەجاڵەت بێ هەژاری »داکه له وەڵامی نامەی دۆستێکدا نووسیویەتی دەڵێ :

که فەرمووته «خەجاڵەت خۆم»، مەفەرموو — ئەویش با زل نەبێ فیز و دەماری
له مێژه دەستی دۆستیان درێژه — خەجاڵەت دەست و پێی کورتی هەژاری
من و تۆ هەر دوو گڕکەی بڕکەیێکین — بڕا بڕبوون به باڵای کوردەواری

دەست کورتە هەتا کوردی وەکوو من      لە هەر مەزرایێکا شین بی بژاری

یا لە وەڵامی نامەیەکی تردا ئاوا خۆ لە باسی سروشت و بەهار دەدزییەتەوە و دەڵێ :

ئەشکی هەتیو بوو بە شەتاو، شەتاو هات و رژایە چۆم
سوێری جەرگی ئاوی بڕی، فرمێسکی روون رووباری کوشت
تاریکە شەو، دەستی نایە بینە قاقای کچی هەتاو
فیڵی خێڵی پۆشتە و پەرداخ، بە تاشای دڵ شڕباری کوشت

کە شیعرە بۆنەکانی شاعیر تا ئەم رادەیە پڕ ناوەرۆک و خاوەن ئامانج بن، دیارە شیعرە نابۆنەکان لە پلەیەکی گەلێک بەرزدان و هونەرێکی ناب و خالیسیان تێدا بەدی دەکرێ.

پێنج پارچەی بەشی سێهەمی ئەم دیوانە ؛راوی وشە ١٣٦٧ ،گوڵی ئاخ ١٣٦٧، باوانەکەم ١٣٧١، قیر و بیر ١٣٧٢ و من و شای پەریان ١٣٧٥ بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ شیعرەکانی پێشوویدا، جێ پێی هەنگاوێکی گەورەیان پێوە دیارە. ئەم هەنگاوە، ئاڵوگۆڕێکە لە شێوە دەربڕین و زمان، ئوسلووب و شێواز، هەر بەم پێیەش لە شێوە روانین و بیرکردنەوەی شاعیر.

هەرچەند شاعیر بە رەوتێکی سروشتی گەیوەتە ئەم قۆناغە، بەڵام نەیتوانیوە بە تەواوی لە قۆناغی پێشووی هەڵبڕێ. هەر بۆیە لەساڵی ١٣٦٧ هەتا ٧٥کە ماوەی لە دایکبوونی ئەم پێنج پارچەیە، بەیناوبەین گەڕاوەتەوە و دە پارچە شیعری تری لە سەر هەمان شێوەی پێشوو داناوە. بەڵام لەم دە پارچەیەشدا، کە رواڵەتیان چۆتەوە سەر ئەوانی پێشوو، شوێنی هەنگاوە تازەکە لە ناوەرۆکدا دیارە. بەڵگەی ئەم رایە پارچە هەڵبەستی فیڵی خێڵی پۆشتە و پەرداخ ەکە لە ١٣٧٥ داینا‌وە.

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی شیعری کۆلیل دەوڵەمەندییە لە وشەی رەسەن و پەتیدا. ئێمە ناچارین لە بەدیهێنانی هەرچەشنە شوێنەوارێکی ئەدەبی، هونەری، لێکۆڵینەوە و زانستی و ... دا هۆشێکمان بە لای زمانەکەمانەوە بێ. قەڵەم بە دەستەکانمان سەرەڕای نیازی هێنانەدی بەرهەمێک، دەبێ هەوڵی کۆکردنەوە و دەکارکردنی وشەی رەسەن و خۆماڵی و رێنووسی یەکدەست و بژارکراو

بدەن. بە داخەوە لەم دیوانەدا لە ڕێنووسێکی پەسند و بێهەڵە کەڵک وەرنەگیراوە. لە زۆر جێگە «واوی عەتف» بە وشەوە لکاوە، کە ڕاست نیە. هێندێ وشە کە ئەشیا لە یەک جیا بنووسرانایە، بەسەریەکەوە نووسراون، وە بە پێچەوانە، هێندێکی ترکە باشتر وابوو بە سەریەکەوە بنووسرێن لە یەک هەڵبڕاون. بزوێنی «و» کورت و درێژ وا هەیە وەبەر چاو نەگیراون. هەر وەها ڕێنووسی هەندێ وشەی عەرەبی پەیڕەوییان لە ئیملای کوردی نەکردووە و هەر بە ئیملای عەرەبی نووسراون. هەڵبەت وا ڕێک نەکەوت کە بتوانم سەرپەرشتی تایپ و پیت‌چنینی شیعرەکان بکەم، بەڵام هیوام وایە کە هات و بەختی چاپێکی ترمان بوو، ئەم تانەیەش لە سەر ئەم چاوە خوێنینە نەمێنێ. بەڵام لە لایەکی ترەوە، وشەی ڕەسەن و پەتی ئەم دیوانە تەواو قورس و پڕ بەهرەیە. شاعیر بەڕاستی ڕاوی وشەی کردووە و لەم ڕاوەدا گەلێک شارەزایە. لەسایەی کوێرەوەری و گەڕان و هاتوچووی زۆرا، هەگبەی لە وشەی لەگوێن تەڵای دەسەوشار ئاخنیوە و هەریەکە تەواو لە جێی پڕ بە پێست دەکاری کردوون:

وەک مسقاڵە زەڕڕە، وشە وردیلە بێ، پەیکی هەواڵ
پەیدای نەکا، زەڕڕەبینیی دیدەی ئەوین تیا دەکا ماڵ
هەرچەن وشە، تاقانە ماسیەکی بەحری بێبن بێ
پەیتا پەیتا خۆی وەشارێ، باوەگەورەی سەغریجن بێ
هەربوولەکەیەکی ڕەمزێ، بۆ قایم بوون لە تۆ و من بێ
دەبێ بۆ چەشەی قوولابی هەڵبەستەکانم نەوسن بێ...

وشەیەک کە نووسەر یا هۆنەر دەیدۆزێتەوە و لە بەرهەمی خۆیدا دەکاریدێنێ، دەتوانێ لە مەیدانەکانی ڕۆشنبیریماندا کەڵکی لێوەربگیرێ و زمانەکەمانی پێدەوڵەمەند بکرێ. بۆوێنە؛ کۆلیل لە ناوچەیەکدا وشەی شوارۆ دەبیسێ کە لە بەرامبەر نبض‌ی عەرەبیدا بەکار دەچی. بایەخێکی تەواوی پێدەدا و لە شیعرێکا کەڵکی لێوەردەگرێ. «بەدەستی تۆیە شوارۆی تازە یاکۆن»، ئەم وشەیە دەتوانێ بچێتە ریزی زاراوەکانی پزیشکی و کەلێنێک لەوێ پڕکاتەوە. بە تایبەت کە فەرهەنگە کوردییەکان جگە لە «فەرهەنگی مەهاباد» هیچیان بەلای ئەم وشەیەدا نەچوون. تەنانەت «کۆڕی زانیاری کورد» یش لە

لیستەی زاراوەکانی زانستی خۆیداکوتەی بۆ «نَبض» داتاشیوەکە بە هیچ کلۆجێک هاوسەنگ و پڕ بە پێست نیە. گریمان هاوسەنگیش بێ، دیسان لە جێیەک وشەی ئامادە لە زماندا هەبێت، پێویست بە داتاشین و سازکردن نیە.

دیوانی «کۆلیل» سەرەڕای ناوەرۆکی پتەو، هەستی ناسک و خەیاڵاوی، بیرو باوەڕ و ئامانج، خۆی فەرهەنگۆکێکی وشەی رەسەنیشە.

لە مانە هەموو بترازێ، ئەم دیوانە و دیوانی شاعیرانێ وەک ؛ مەلاکەریمی فیدایی، سەییدمحەممەد تاهیری هاشمی، شپرزە، ئاوات، حەقیقی، خاڵەمین، ... لەم روانگەوەکە بەرهەمی دوایین ریزی شۆڕەسوارانی ئەدەبی کلاسیکیمانن، رێز و حورمەتێکی تەواویان هەیە و بە چاوی نوێنەری قۆناغێکی ئەدەبیمان دەبێ لێیان بڕوانین.

سەید عەبدوڵڵای سەمەدی

مەهاباد ۱۳۷۷

# گازە

خوا ئەی نووری گسیانی بێهەتاوم
خوا ئەی گەنجی بێحەدد و حەساوم

ئیلاهی ئەی پەناهی دەردمەندان
چرای شەوگاری تاری موستەمەندان

گونا باری فەقیری بێنەوا من
نەخۆشی دەردەداری بێدەوا من

بە ئاهی ئاورینی عاشقانە
بە ناڵە و شین و گریانی شەوانە

دەسم بگرە بەجێ ماوم بەجێ ماو
نەجاتم دە، لەگورِم و تۆفی سێڵاو

ئیلاهی ئەی چرای ماڵی دەروونم
تەوەژمی حاڵی سەردی تەفرە چوونم

بە تۆ بەرپایە، هەرچی بوو، بە هەستی
لە خوار و ژوور و باڵا و نزم و پەستی

ئەگەر چی من لە رێ بێزەین و کوێرم
بە شەرِ فێر و، کنارەگر لە خێرم

وەلێ تۆ سورمەکەی چاوی ئەوینی
پەنای بێدالدەکانی سەر زەوینی

خوا ئەی عەتر و بۆی باغی بەهاری
پەڕ و باڵی کەوو قومری و قەناری

لە خاک و خۆڵی ئەم ماڵەم وەدەرنێ
لە شەونم روونترم تاجێ لە سەرنێ

لە چاڵی خۆ پەرستیم دەربهێنە
غەمی خۆمم هەتا هەم لێبسێنە

ئیلاهی تان و پۆی گیانم چڕاوە
لەگش لا، غەیری خۆت دەستم بڕاوە

خوا، ئەی بۆ ئەوینم ، نوری گیانی
خوا، ئەی سروەکەی ، کاتی بەیانی

دڵم زیندو بە یادی تۆوە ماوە
ئەگینا ئەسڵی سەرمایەم نەماوە

لە بەر باری گوناحان تاڵەکامم
لە شەکری لوتفی خۆت بڕژێنە جامم

ئەگەرچی مەستی دەستی نەفسی پەستم
وەلێکن خۆت ئەزانی حەق پەرەستم

بە نووری تاعەتت رۆشنکە ماڵم
بە تاریکی بە سەر چوو مانگ و ساڵم

هەموو گیانم سوواوی ئێش و دەردە
دەروونم هەر وەکوو زستانی سەردە

ئـــيلاهی مـــن یـــەکـــێ شـــەیتان هـــەزارە
تـــەمەننای نـــەفسی زاڵـــم بـــێژمارە

خـــواوەنـــنا لە دەســـتمدا ئـــەوەی بـــووم
ئـــەوا ئـــێستە مـــن و خـــێڵی شـــەڕ و شـــووم

بـــە دەرگـــای تـــۆ پـــەنام هـــێناوە ئـــاوە
کـــــە تـــــاوی دژمـــنانم پـــێنەماوە

بـــە ئـــەو هـــیوایـــە تـــۆ زاڵـــێ نـــەزەرکەی
لە دەســـتی نـــەفسی ئـــەممارەم وەدەرکـــەی

گـــرێ کـــۆڵەی ژیـــانم بـــۆ بکـــەیتۆ
شـــەڕی شـــەیتانی دووم لی دوور بـــخەیتۆ

دڵـــە نـــائاشناکـــەم ئـــاشنا کـــەی
لە زەنـــجیری هـــەوەس گـــیانم رەهـــا کـــەی

خـــوا ئـــەی راخـــەری فـــەرشی گـــیا و گـــوڵ
کـــوڵ و ســـۆزدانـــەری نـــاو نـــاخی بـــولبوڵ

خـــوا ئـــەی راگـــری ئـــاسمانی ئـــاوی
خـــوا ئـــەی دوور لە نـــەقس و نـــاتەواوی

بـــە عـــیشقی عـــاشقانی مـــەست و بـــێهۆش
لە بادەی دەستی تۆ، مەی نۆش و سەر خۆش

بـــە قـــەترەی خـــوێنی گـــوڵڕەنگی شـــەهیدان
بـــە بـــانگی پـــڕ لە هـــیوای نـــائومیدان

بـــەوانـــەی ئـاشنای مـەرزی ســنوورن
لەگـــــەڵ نـــاشارەزائـــیدا بـــە دوورن

بــە ئــایەت ئــایەتی قــورعان و شــەرعی
بــە بـێخی ئـەسڵ و پـۆپە و بـەرگو فـەرعی

بــە سینەی پـڕ لە خـۆسپەی دەردی دۆست
بـە پـۆسی بـێشەقاری تـەپڵ و کـۆست

لە رووما دەرکـی رەحـمەت ئـاوەڵاکـە
بـــە دڵ ئـــیمان و دیـــنم بـێبەلاکـە

لە هـەر کـوێ سـۆزی عـیشقی بێ لە پـێدا
ســـەر و مـــاڵم بســـووتێنە لە وێـــدا

وەهـــا بـاڵی ئـە وینم بـۆبکەی سـاز
بـــەرەو تـــۆ هـــەڵفڕێتو، بـێتە پـەرواز

لە خـــەونم راپـــەڕێنە تـــا نـــەمردووم
خەوی غەفڵەت شـوعوور و هـۆشی بـردووم

شــەوی تـارم بـە هـیوای سـوبحی تـۆیە
ئـەگـەرچـی شەو درێـژەو هـەر بە سۆیە

ئـــیلاهی رووتـــەڵ و خـــەستە و نـــەخۆشم
بـە بـەرگی تـۆ، مـەگـەر خـۆم دابـپۆشم

لە دڵ مـــــانووم لە ژێـــر داری گـــرینا
بــە دڵ دەرکـــە، لە پــای چـەشمەی برینا

هەر ئەو زەخمەی لە خوێنی، گوڵ دەپشکێ
دەروونم تاسەکەی بە شکێکوبشکێ

موناجاتی شەوانەم پێ عەتاکە
بە ئیکسیری عیشق دەردم دەواکە

بە ژانی خۆشەویستیم موبتەلاکە
لە ئەوریێدا لەشم کێڵگەی بەلاکە

ئیلاهی دڵ خەمینی بێ ئەوینیم
دەڵێی ئەو جیا لە ئەمن و من لەوی نیم

کز و (کۆلیل)ی کەسری مەیلی لەیلم
ئەمن ئاوارەکەی حاچەو دو جەیلم

دەسا تۆ حەقی والد، بەشق مەولورد
محمّد احمد و مەسعوود و مەحموود

بە ناوی ئەو کەسەی گیانی رفانم
وەکوو کارگێ لە عەرزی هەڵ کفانم

بە ئەو جەمعە کە نالآنی شەوو رۆ
بە زەبری خاڵو شمشێری دو ئەبرۆ

بە وەی وا قەلبەکەی عەرشی بەرینە
گوڵ و باڵی فرشتەی بۆ سەرینە

لە رێزی قەومی دڵدارم حەسێوکە
لە خێو گیانی ئەویندارم بەخێوکە .

# ئاواتی ئەمەل

لە ئاسۆی مەککەوە ئەو شەو هەتاوێ، تینی بە ژیاندا
لە واتەی گەرمی گرشەی، کێ دواوێ، لاڵە لە زماندا

هەتاو و مانگ و ئەستێرە، لە روویا بێ شۆڵە دەمێنن
هەتا ماون وەکوو شێتێ بە دوویا هەر پەل دەوەشێنن

کەسێ چاوی هەڵێناو هاتە نێو سەف، ئاواتی ئەمەل بوو
پەشۆکا یوسفی میسری، لە جێ کەف، دەستی دڵی پەل بوو

چڵەی چاوی شەوی تاریک و رەش بوو، ئەم تۆپی زەمینە
عەیاری زێڕی هەر پڕ غەللو غەش بوو، بێ شاهی مەدینە

زمانی کۆڵە، دەم دووراوە، هەڵبەست، ئەی رەحمەتی باری
بە شیعری سارد و سڕ، پێت ناگەیی هەست، تۆ گیانی وتاری

لە سەر (اُمّ القرا) تەیری هەواڵم، هەیهاتە سەماکا
تەمایەر ئەحمەدە کۆتری خەیاڵم، دانەی بە دەماکا

لە دەوری خۆر زەوی هەر خۆ ئەگێڕێ، وەک تاقمی مەستان
لە خەتتی نووری تۆی چون پێیە دێڕێ، قەت نایەتە وەستان

لە ڕێگەی زوڵفی تارو پەرچەمی تۆ، شەوکردی شەوارە
نەبوو میوە کە شیرین وەک دەمی تۆ، خۆیدا لە قەنارە

لە لێوت چەپکە چەپکە گوڵ بووە شین، لەو ساتەوە بۆیە
لە ناخی بولبولاً هەر شینە یاسین، هەر ناڵەیە، ڕۆیە

بەهاران دەشت و دەر کاکی بە کاکی، مزگەوتی گوڵ و گیان
وشەی پاکت دەکەن پێشکەش بە چاکی، پاکی بە دڵ و گیان

بە دەستی تۆیە شوارۆی[1] تازە یا کۆن، ڕوانیمە لە (لەولاک)
(نفختُ فیە مِنْ روحی) لە بەر تۆن، کردی بە بەشەر خاک

وشەی شایەی ئەوینی وای بە لێوۆ، نەبوایی لە وێوۆ
بە هەر دو زەرد و وەرد و پەرد و کێوۆ، چی ڕۆژە بە شێوۆ

بە میوەی پڕ لە تام و بۆی بە هێوۆ، هەنجیر و ترێ‌وۆ
بەبێ نێو بە نێو میو سێوۆ، چی شارە بە دێوۆ

نەبوون، هیچێ نەبوو نەک هەر ئەوانەی، بوون گشتی لە بەر تۆن
خودا نیت، عیللەتی غائی و بەهانەی، بۆ تازەوو هەم کۆن

مەلایک گوێ بە فەرمان و ئیشارەت، ملیارە بە چین چین
کەسێ بیبێ لە هەستیدا سەدارەت، خاقانیی چین چین؟

---

١ - شوارۆ: نەبض

بــه ئــیعجازت بــنازم ســەروەری دیــن، خوسرەو لە عەجەمدا
بــه نــاشیرین دوابــوو، تــۆ بــه شیرین، جەرگت لە قەڵەمدا

نــەچرِیا تــاڵی جــاڵجاڵوکه، بـۆ کـەس، تا بوو بە مەتاڵت
بە کوێری چاوی دژمن بوو بـه چـاو بـەس، کۆتری بەری ماڵت

خودا ئەو کـاته تـۆی فـەرموو بـه سـەردار، زاڵم دڵی تۆقی
سەری خوێن رێژو ناحەق چوونه سەردار، بەو دارەوە چۆقی

کـــه هــاتی زۆر و زەرِ کـــەوته نــەهاتی، زانین بووە یاسا
حەکـۆ بـوو شـەرعی بـوجەهلی بـەلاتی، تا سا دەمی پاسا

دەمێ بوو دیل و کۆیله و کچ رەش و سوور، بێبارە لە ژین بوون
ژیــانێ پــرِ له تــاڵی و بـێسەفا و سوور، لەش پارە بە قین بوون

کول و کـوڵ بـوونەوە برِیان بـه دەس تـۆ، شمشێر و دەس و زار
ئــەوانــەی وا درێـــژ بــوون بـۆ قـەلاچۆ، بۆ زاڵمی زۆردار

سـەرت هـەڵبێنە ئـێستەش یـا مـوحەممەد، برِوانە وەلێ ورد
بــه ســینەمدا مـەدە تـۆ خـوا دەسـی رەد، وەک بەختی گەلی کورد

وەرە بـــرِوانـــه زاڵــم وەک لەمـــەوپێش، هەر فێرە بە بێهێز
گــەلێ راوچـی لە بـۆ ئـاسکێکی دڵـرِێش، نیشتوونەتە پارێز

وەرە ئێستەش لە دوو گوێ دەنگ ئەداتـۆ، قیژەی ژن و منداڵ
سەدای شیوەن لەسەر نـەزمی هـەوای رۆ، بێدارە لە هەرماڵ

تـــەرانـــەی نـــەرمەلاوێنی هـــەتیوان، هاواری سوخۆمیک
بە هۆی هەورەتریشقەی عـیلمی ئـینسان، عالەم بووە تاریک

وەرە ئـێستەش گـلێنەی چـاوی رەنـجۆر، میوەی خەمی ناسۆر
وەرە زەڕ باوەڕان ئێستەش جـەم و جـۆر، هەر خۆرەن و خوێن خۆر

وەرە ئـــەوسا ئـومەییە هـەر یـەکێ بـوو، ئێستاکە هەزارە
وەرە بـــاکـــوو بـزانـی چـۆمی یـەرغوو، زووخاوی هەژارە

لە ســـینگمدا بـلووری دڵ بـــەرۆ بـــوو، قلمۆبوە سەبری
شەویلەی حـەق وتـن لە گـرێجەنە چـوو، نانا، چوەقەبری

وەرە ئێستەش ژن و شوو کـەچ لە رێگـان، فەرمانبەری شەیتان
تەنووری داخی شەهوەت زۆری سووتان، منداڵی بەسە زوان

وەرە ئاخر فەرەنگ و رووس و سـەهیۆن، سەد، دامن و (سەددام)
وشەی زەختە و زەرەر، رووخاندن و مۆن، بۆ میللەتی ئیسلام

وەرە بـــیبینە شـــەڵغەی نـــاوی جـەنگی، گورزی دەسی ئیبلیس
لە سـەر قـەلبی خـەلیجم بـوو بـەسەنگی، ئەمریکی و ئینگلیس

سکـــالأی قـــرچـه قـرچـی زامـی سـەردەشت، لەو بۆمبە کەسیفە
کە تا سەر پـێشە گـیانی خـەڵکەکـەی چـەشت، ئەو خەڵکە شەریفە

سکـــــالأی ئـــــەو هـــەموو دیــق و فــجووقە، ئەو هەمووە پەژارە
سکـــــالأی ئـــــەو هـــەموو تــۆقلە و بـلووقە، ئەو هەمووە خەسارە

بە لای تۆ ئەی موحەممەد(د.خ) نوێنەری حەق، زەبرێ بەلە شۆفار
(عـومەر) کـاتێ شـەوی رەش بـاتە بـەر شـەق، (کۆلیل) نییە ئەو جار

**بە هۆی لەدایک بوونی حەزرەتی رەسول (د.خ)**
**لە بەرواری دوانزەی (ربیع‌الاول)ی ساڵی ١٣۶۶ای هەتاوی**

# تاریکی تارا

الله اکـــــبر تـــــاریکی تـــارا
بوو بـه دەریـای نـوور مـەڵبەند و سـارا
نــەغمەی ســەرمەدی لە نـاخی نـوورا
دەنگـــی دایـــەوە لە خـــوار و ژوورا
الله اکــبر رۆحـــی لە دەس چـــوو
خـــوا گـیانێ تـازەی پـێ‌عەتا فـەرموو
لە گــوێسوانــی لێــو تــەیری پـێکەنین
کــردی هــێلانەی واژەی هـەورێشمین
الله اکــبر جــەزبەی شــەوق و شــوور
روو بە عەرشی خوا دەمـبا بـەرەوژوور
لە ســەر شــەقام و رێگــەی عــبوورا
کـەوتمە مـل گـەنج و خـەرمانی نـوورا
گــەییم بــە شــارێ پـڕ لە عـەتر و بـۆ
پـــڕ لە بـلوورین کـۆشکی سـەر ئـاسۆ
بە هـۆنەی بـاڵی مـەلی مـەوجی هـۆش
سەدای فـرشتەی عـەرشم هـاتە گـۆش
لە ســەفا و مــەروەی حــەجی دڵــبەرا
زەمــزەم دەبــینم لە نــێو کــەو ســەرا
بە قەستی تەواف کوڵم و خەت و خـاڵ
کــۆترە نـەخشینە دای لە شـەقەی بـاڵ

نــــەکــا خـــەیاڵم بــمرێ لە ســـوێدا
بــاهات و چــۆکــا، بــێره و بە وێدا
الله اکـــــبر هــــیوای لە دەس چـــــوو
خوا گـیانی تـازەی پـێ عـەتا فـەرموو
هاژەی شەپۆلی بـەحری شـۆڵەی خـۆر
کەڕدەکا دوو گـوێی خـێڵی زڵـم و زۆر
ئەم شەو بە راسـتی مـەحشەری نـوورە
لە جـنەی دیـدار و جـەشنی حـوزوورە
دۆس لە یــــانەکــــەی ئــوممەهانیدا
دەبـــێ حــــازر بـــێ لە مــیوانــیدا
بە سواری بـۆ راق تـاجی دیـن لە سـەر
دەعوەتی حـەققە، ئـەحمەدی سـەروەر
پــەری پـەلەپەل قـامکی خـۆی گـەزی
تــا بــیستی جــاڕی (سبحان الّـذی)
ئـــیتر ئـــاواتـــی نــەما ســەماوات
(لَـیْتَنی کـنْتُ (تراب)ەی جـێ هـات
الله اکـــبر لەو ســـــفرە و خــــووانــە
لەو ریّـز و حـورمەت بـۆ ئـەو مـیوانـە
بــــاڵی مــــەلایک چــەتر و ســێبەری
پـێشکەشی بــاڵای، حـوکمی رێـبەری
بــە دۆســـی فــەرموو دڵ رفـێن دڵــبەر
لە سەر ئیزنی من بـووی بـە پـەیغەمبەر
چــیم لێ داواکــەی درێــغی نــاکــەم
من کانی کەرەم، سـەرچـاوەی چـاکـەم

الله اكـــــبر لەو گـــــفتوگۆیە
پــــڕ لە ئــاهەنگ و نــەزم و شكــۆیە
خــوایــە دەروونــم بــەحری خــەمانە
ژیــــانی فـــەقیر بـــەرەو نـــەمانە
وەخــتێ ئــەبینم بەرقی ئەشكی ئاڵ
لە گۆشەی چاوی كیژی كرچ و كاڵ
وەخـــتێ ئـــەبینم ژنـــێ بێچارە
شـــەپۆلی نـــیگای پــڕ لە هــاوارە
وەخـــتێ ئـــەبینم تــاسە لە نــاخا
بــە چەشنی بلوور دەشكێ لە داخا
وەخـــتێ ئـــەبینم پــۆلی گــوڵاڵن
بــە دەســتی هــەرزە دەڕوا بــە تاڵان
وەخـــتێ ئـــەبینم دایــە بــۆ رۆڵــە
دڵ لە دەرونـــیا دەبـــێ بــە كــۆڵە
وەخـــتێ ئـەبینم جــوانــێ نــاكــام
بـــۆ تــیكە نــانێ دەبــێ بــە غــوڵام
وەخـــتێ ئـەبینم ســومییەی هــەژار
گــیرە بــە مــەكری ئـومییەی لاسـار
وەخـــتێ ئـــەبینم شــەللاقی زۆردار
لە چـــینی بــێ‌زۆر دەردێــنێ دەمــار
هـــیچم لێت نـــاوێ رێ نـوێنم بــە
دەسگـــیری كـــاری دڵ تــەزێنم بــە
مــەگــەر لوتــفی تــۆم بــێ لە پــەنادا
ئەینا ئەم چــەرخــە، رێ بــە خــۆم نــادا

الله اكبر لەم تەمەننایە
لەم شفا و لاڵەی شابۆ گەدایە
چەشنی هەناسەی دەمە و بەیانی
ژیان ئەچۆڕێ لە سەر لێوانی
کەسێ ئەمینە سینەی لە کینە
دیارە (رحمةً لِلْعالمين)ە
الله اكبر زوانم چەن کۆڵە
مێشکم لە باس و تاریفی چۆڵە
خواکە خاوەنی ئاسمان و ئەرزە
فەرمویە پلە و پایەکەی بەرزە
جەماڵی هەستی یەک زەڕرە نووری
هەر زاتی حەقە کەوا لە ژووری
(کۆلیل)م دەروون پڕ لە کەسەرم
شاباشی دۆس بێ شیعر و هونەرم

قەلا رێحانە ١٣٤٦ای هەتاوی بەلاّم لەم دواییانەدا کەمێ دەسکاریم کردووە.

# خۆزگە

خۆزگە وەکوو پەروانە، بە کۆڵی گوڵەوە
خۆزگە وەکوو شەونم بە کراسی چڵەوە

خۆزگە وەکوو خەم، گۆشەنشینی دڵەکەم
خۆزگە وەکوو سۆزێ بە گەرووی بولبولەوە

خۆزگە وەکوو ئیلمەی بەنی تەونی نەتەوەم
خۆزگە وەکوو ئەو خوێنە بەرووی سومبولەوە

خۆزگە وەکوو ئەو شۆڵە بە گۆنای شەمەوە
خۆزگە وەکوو ئەم خۆزگە بە ناخی دڵەوە

خۆزگە وەکوو ئەو خاڵە لە پاڵی دەمەکەت
خۆزگە وەکوو داوێ بە دوپێی قاتڵەوە

خۆزگە وەکوو ئەو شانە بە شانی سەرەوە
خۆزگە وەکوو چاوزیتی بە یاساوڵەوە

خۆزگە وەکوو شکیانی دڵی من بەڕەمت
خۆزگە وەکوو ئاهوو بە رەوشتی سڵەوە

خۆزگە وەکوو ئەو ناسکییە وا بە مووۆ
خۆزگە وەکوو ژیری بەسەری عاقڵەوە

خۆزگه وەکوو رووتی لە رەمەق روومەتی خەو
خۆزگە وەکوو ئەو کینە بە سینەی مڵەوە

خۆزگە وەکوو زەنگی بە رواڵەی رەشەوە
وەک بەزمی هەژارێ، بە کەوایێ کوڵەوە

رۆژێ (عومەر)یش گوم ببووایە لەشەوی
خاڵی رەشی تۆدا، بە دڵێ ماتڵەوە

خۆرەی خەمی شەوگاری جودایی ئەجەلە
تۆ خوا وەرە لام وادەچمە ژێر گڵەوە ٠

دیواندەرە پووشپەڕی ساڵی ١٣٦١ای هەتاوی

## ئەوکی شعوور

وەی وەی لە هەناسەی دڵی من، چەن بە کوڵە
هەی هەی کە پەژارەی خەمی تۆم چەن لە دڵە
دەی دەی بە نقێمی بەری موورووی ملەکەت
پەی پەی بکە داخم، کە لە رەنگی سکڵە

✣ ✣ ✣

مەس مەس چییە؟ هەر دێیو دەچی، دڵ دەسوی
یەس یەس، بە زمانی بەریتانی دەدوی
خەس خەس، قورِی کویّ بێنم و بینێم لە سەرم
کەس کەس نییە کورد بیّ و بە دڵم بیّ بە دوی

✣ ✣ ✣

یەک یەک نەبیّ وەک تۆ، بە حەریفم نەبوو کەس
دەک دەک لە برۆی تۆ، بە خودا قودرەتی هەس
چەک چەک بووەوە گەرچی لەشم چش، لە مەرِا
تەک تەک مەکوژە، رائیی بە نەو، کەرِتیّ بە یەس

✣ ✣ ✣

دەم دەم نییە، زەمزەم بە بزەت، دێتە وزە
کەم کەم نییە، عالەم بە وزەت، کەوتە بزە
ژەم ژەم کە نەبینیّ منی ئاوارە دەمت
دەم دەم نەفەسم دێت و دەچێتن بە دزە

✣ ✣ ✣

قەف قەف بخەیە قۆڵ و ملم پەرچەمی کاڵ
گەف کەف لە دەمی بێو، بە جنێو بیکەیە گاڵ
سەف سەف دەبەسم باڵی خەیاڵاتی خراو
ڕەف ڕەف نەفڕی، وەک دەفڕم من بە خەیاڵ

❈ ❈ ❈

فلفل کە لەلایە لە حەنای خاڵی ڕەشت
بلبل فڕی نایە لە پەنای کوڵمی گەشت
چل چل لە گوڵیشی بە دەمۆ پێ بکەنێ
پل پل پەلی کەن، تاکوو بەری بێ لە بەشت

❈ ❈ ❈

کز کز دەکەوێ لێوی خەیاڵم، کە لەڕووت
دز دز دەکەوی لێی و موژەت هەردو بە جووت
چز چز بەدڵی‌دا دەچەقێ، رادە چەنێ
خز خز دەخزێ، پێی دەشکێت و سەر و لووت

❈ ❈ ❈

وڕ وڕ لە بەری پێت دەکەوێ، عەتری چنوور
گڕگڕ لەمەری سینەکەتن، مەشخەڵی نوور
پڕ پڕ لەخەمی رووتە دڵم، وا دەڵە بوو
شڕ شڕ بە هەنسکم بووەوە، ئەوکی شعوور

❈ ❈ ❈

لەق لەق بە دەنوک چۆن دەتەقێنێ گڕ و گۆڵ
تەق تەق بتەقێنی لە دڵم، تیری مژۆڵ
هەق هەق کوتن و دەس خۆش‌و ئەحسەن هەقمە
شەق شەق شەقیشم کەیت‌و کەلاکم خەیە چۆڵ

❈ ❈ ❈

خش خش دەخشێتن کە هەیاسەت لە کەمەر
کش کش وەکوو بێژی بە مەلی گیانی (عومەر)
چش چش لە قەوارەی لەشی بێچارە دەکا
فش فش هەڵەوەستێ بەدەنم، مات و کەسەر

سنە بانەمەڕی ١٣٦١ای هەتاوی

# گۆم تا قووڵ تربێ مەلەی خۆشترە

ئـاوابـوون ڕۆژێ ڕۆژکـردی بـە بـاو	بوو بەشەوەزەنگ
کە ڕۆژی ڕووی تۆی هێنایە بەرچاو	سەری دای لە سەنگ

هـەنگێ لە بـاخی جـەماڵت، ئـەگـەر	سەربدا جارێ
لە دووکەڵی مۆم تـا ڕۆژی مـەحشەر	گولاّو دەبارێ[2]

جوانی لە ڕووی تـۆ، خـۆی ڕازانـەوە	پەری و حۆری چوون
کـە تـۆیان بـینی بـەم سـامانەوە	لە داخا گوم بوون

جـیرانت نـەبوون کـارمامزو[1] کـەو،	حەیرانم، حەیران
لە کێوە فێر بووی؟ وەک خەیاڵ وخەو	بەلەنجە و سەیران

چونکە شیرین نین، وەک دەمت مـیوە	هەموو بە جارێ
بۆخۆ خـنکاندن خـۆی هـەڵواسـیووە	هەریەک لەدارێ

لە ئـاڵی لێـوت، لە شـەرمی چـاوت	نێرگز و یاقووت
خەجاڵەت بـارن لە حـەیف و تـاوت	هەردوویان بەجووت

---

١- بێچوە ئاسک

٢- - ئەم شێعرەم لە فارسیەوە وەرگێڕاوەتەوە.

دەڵـێن کـە زەنگـی واتـە قـوڵەرەش، بێ بەشە لە ژین
چەوساوە بـە دەس پـۆلی سـپی‌لەش ئەی زوڵفی تۆچین؟

مەگەردوورەشمارلەسەرمانگی‌رووت پەپکەی نەداوە؟
لەوێـدا سپی، بە هـۆی رەش و رووت رەش هەڵگەڕاوە

لە خواری گـەردەن، لە ژووری سـینە، وەها چاڵێکە
هـــەناسەی وشـــە لەوێ بـێ‌تینە یا مناڵێکە

بۆیە دەگەڕێن هەموو کەس بـۆ مـانگ لە سەر مانگی نۆ
چوونکە دەزانن روونەو بە نێو بـانگ وەسە ئەبرۆی تۆ

دەروونـــم خـــەمی هـەڵبژاردووە بە خەم سەر خۆشە
پـەیامی بـۆلای زوڵـفت نـاردووە بۆیە ڕەش پۆشە

لە سافی سینگت، پای خەیاڵ ئەخزێ شەل و بێ‌حاڵە
پشکۆی نەتوانین بـە دەمـیا ئـەچزێ تا مەحشەر لاڵە

مەندیلی[1] قەندیل یا خۆ چـل‌چەمە، سەرد و داماون
چۆن بە سـپیەتی ئـەو کـوڵمە شـەمە ناگەن و ناون

---

١- مێزەر

گەر دەڵێم هەنار یا جووتێ سێوە | ئەو جووتە مەمە
یا خۆ دوو قوببەی زێوەر و زێوە | لام وایە زەمە

مەتەڵێ باوە بزوینی جیوە، | دەزانی بۆچی؟
لە رە و بزوینی کەمەرتی دیوە، | لەو کریا گۆچی.

تا دەم دەکەیتۆ بۆوتە و بەیان، | دڵ دێتە زاری
وەک سۆزی گەرووی شمشاڵی شوان | لە کوردەواری

بۆنی گولاڵە دائەچلەکێنێ | بۆنی هەناسەت
کولمت پەپوولەی لێو دەسووتێنێ | وەک من لە تاسەت

لە بەر تسریفەی خۆری جەمینت | گیانم ئەدا چڵ
لەشی لاوازم کەوتە کەمینت | پای چەقی لە گڵ

بە سوختەی نوختە نوختەی خالآنت | سەرگێژ و مەنگم
نەختە نەختەی گیان چوو بە تالآنت، | وەک دڵی تەنگم

بادەی سادەی خەم هەتا کەی، دادەی، | گیانم وەرگرە
گۆم تا قوڵتر بێ دەبێ بڕوا کەی | مەلەی خۆشترە

بە خورە خوری فرمێسکی دووچاو | دووگۆنام سووتا
(کۆلیل)یش خنکا لە گۆمی زووخاو، | دووربێ لە رووتا

سەقز ـ گەلاوێژی ١٣۶٣ی هەتاوی

# سەری شاعیر سەری خەڵکە

لە نــــاخی بـــێ دەمــاخی‌دا دەژێــم و نــیمە ژیــوارێ
بـــە تــاسەم بــۆ ژیــانی پــڕ لە ژانــی پــار و پــێرارێ

لە داخـــی دۆخـــی تــەنیایی، لە ژانــی ژیــنی رسـوایـی
لە دەس دەرچووم بە خۆڕایـی لە گـێژی گـۆمی رووبـارێ

بــە کســپەی خــەم دڵــم بـرژی لە تـاوانـا لەشـم گـرژی
کە پێچی پـەرچـەمی کـرژی، دڵـی گـەستم وەکـوو مـارێ

هــەتیوی بــەر هـەتاوی خـۆری زەردی سـەردی پـاییزم
تـەقەی سـی‌ودوو ددانـم دێ، لە پـای وێـرانـەی دیـوارێ

شـــــپرزە حــاڵ و شــێواوم وەکـــوو بــەفرێ ئــەتاوێمۆ
کــە تــۆپخانەی شــەماڵی گـڕ دەکـا چـاری بـە هـاوارێ

سرشکم گـرتکە خـوێنە، وەکـوو چـاوی شـەوەق سـوورە
لە پـــرزۆڵەی دڵـــێ وردە، لە دەسـتی دوو دڵـی یــارێ

بـە بـلوێرو بـە بـالۆرە، بـە (وەی مـن وەی مـن) و هـۆرە
بـە گــۆرانـــی هـــەزار جـۆرە دەنــاڵێنم وەکـــوو تـارێ

کــە بــەڵکوو ئــەو دڵـەی بـا بـردەڵەی سـووکم بـلاوێتۆ
وەلێ (کۆلیل)ی کۆیلەی خەم بە تاری چۆن دەبێ چـارێ

کــەسێکی‌تر وەکـــوو کـــوردم نـەبوو ئـازیز و دڵ بـەستە
لە سەرما بوو سەرم پۆیلەی بەری پێ‌ی کەم کـوتم جـارێ

سەری شاعیر سەری خەڵکە، بە سەر ئاوی حەمامۆکەی
ڕەوایە (پێشکەش) و پۆیلە، لە دێهاتێ وەیا شاریێ

لە نێو ئەو خەڵکەدا گشتی، لە پڕ بەژنێکی کوردانە
سەری بردم دڵی بردم کوڵی کردم بە گوفتاریێ

بە زەنگوڵ زەنگوڵی زووخاو، لە هەنیە و ڕوومەتی رووخاو
بە ئاوی چاوی دڵ سووتاو، کە دیمی دوێنە ئێواریێ

بە توندی تێپەڕی وەختێ، سەرنجمدا کەچی نەختێ
لە پرزۆڵەی دڵی وردم لە دەستی کەوتەتە خواریێ

هەڵم گرت و کوتم من کێم؟ کوتی تۆم قەت نەدیوە قەت
کوتم مەر تۆ دڵی من نیت؟ کوتی شێتی؟ کوتم ئاریێ

کوتی شێتی چ شارێکی؟ کوتم شاریێ کە لەو شارە
(بەڵێن) و مەرجی (پەیمان) و وەفا دریان لە سێداریێ

کوتی سوێن بەو وەفایەی دەستە مۆیم، من گەلێ وەختە
دەزانم شێتی هەر شاریێ، گرووگیرن هەموو جاریێ

(عومەر) واتێ گەیی پرزۆڵەکەی دڵ پێی دەڵێ خۆزگە
بەوەی دریا لە سێداریێ، بە بسکی شۆخو نازاریێ

## سۆزی پەروانە

تۆ کەی جوانی؟ من شیعری جوانانەم هـەیە
تۆ کەی شێتی؟ مـن عـیشقی شـێتانەم هـەیە

تۆ کەی مەستی؟ تـەوەژمی مـەستانەت نـییە
وەکوو رووت من درۆشمی مەستانەم هـەیە

تۆ لەیلێ نیت، مـەجنوونی دێـوانـەت مـنم
بێ قەوڵی تۆ، مـن قـەوڵی مـەردانـەم هـەیە

قەت بۆ شناس سەرێ جوامێرانـەت نـەبوو
هەر مـن دایـم خـەمی تـۆی بـێگانەم هـەیە

تـۆ شـیرینی، هـەنگوینی نـێوشانەت هـەیە
وەلێ خۆ من هەنگی وەستای شـانەم هـەیە

تـۆ دیـوانـی، وشـەی ئـەو دیـوانـەت مـنم
تـۆ هـەڵبەستی مـەلی دڵ، مـن دانـەم هـەیە

تـۆ بـەحرێکی، شـەپۆلی بـەحرانـەت نـییە
بـــەڵامێ مـــن گـــریانی هـــەورانـــەم هـەیە

تۆکەی شەمی؟ئەو کـوڵمە جـوانـانەی ئـەتۆ
من کردمە شەم، چوون سۆزی پەروانەم هەیە

تۆ چەپکێ گوڵ پەرچەمێ خاوانـەت هـەیە
ئـەمما مـنم بـۆ زوڵـفی گـوڵ شـانەم هـەیە

ئەونەی ئـەتۆ بـۆمبای تـیر و تـانەت هـەیە
من گریانی کانی سێ پـلووسکانەم[1] هـەیە

له نـەورۆزا بـە نـێوی جـێژنانەی «عـومەر»
خەمتدا، چون من بۆ خـەم هـێلانەم هـەیە

لەو هـــێلانە هـــەوارە وێــرانــەی دڵــم
له نـەزمی خـەم خـەرواری تـەرانـەم هـەیە

**چۆلاخ رەشەمەی ١٣٤٨ی هەتاوی**

١- نێوی کانییەکی خۆش و ئاو زۆری دیواندەرەیە.

## سۆزی شەو

سەرزارەکییو دەمدەمی ئەو ڕۆکە،کە لاتە
کێ ڕاست و بەڵێن دارە، کولۆڵ و کەلە لاتە
هەرکەس بە درۆ هاتە بەرۆ، شێخ و مەلاتە
کام دڵ پەلی دەرکردوە بۆت، چەشنی مەلاتە
بێچارە بە بەرقی غەزەبی، هەور و هەڵاتە

✧ ✧ ✧

دەس نوێژی لە شەونم نە دەشت بووکی بەهانەم
نەک پۆلی گوڵاڵە لە پڕا بیدەنە تانەم
چۆکی بە کەرەم نایە زەوی، شیعر و تەرانەم
شمشاڵی شوانی دەبەزان، سۆزی شەوانەم
تـۆی بۆ نـەبـەزا، بۆ ئەوە تۆ دەردە تەڵاتە

✧ ✧ ✧

تۆ مەستی خەیاڵی لە مەیانی زەڕ و زۆرا
من پووش و پلاشم لە کلاشی ڕەش و بۆرا
تۆ بزری لەگەڵ کەم، وەکو دەنوێنی لە زۆرا
من سەهم و بەشم وا لە کەمێ خەوش و مرۆرا
بەرقەوڵی وەفا بوونمە ئەم جۆرە خەڵاتە

✧ ✧ ✧

تۆ چەتری بەهارت لە سەرە سەوزە سەراپات
من شیوەنی پاییزی خەمم هاتە مولاقات
تۆ خۆری مورادت لە کەلی بەختەوە دەرهات
من رۆژی ژیانم شەوی تاریکی بە سەرهات
ئەم چەرخە نەفامیشە، دژی بێدەسەڵاتە

✧ ✧ ✧

ئەو ئاورەیەش داتەوە، بێئاور و سەردوو
ئەو گیان و بە قوربانە وتت نوێنەری دەردوو
ئەو نەرم و نیانیتە نەبوو، رەق وەکوو بەردوو
ئەو چەپکە گوڵەش داتە دەسم، سیسەڵو زەردوو
بۆ رەونەقی بازارتو ئەو بانگ و سەڵاتە

✧ ✧ ✧

جارێ نەبو کارێ بکەیو من بڵێم ئۆخەی
بێوەی بە دزە بێمە دزی، نەیکەیە هەی هەی
ئاواتی ئەوین پشتی شکا، ساوەرە تاکەی
ناگەی لەمن و چاکەمو خاوەن زەڕ و چاکەی
ئەو چایە، کە چەن یۆسفی تێدا رەقەڵاتە

✧ ✧ ✧

پەیکانی موژەت ئەونە برینداری نەبوو خۆ
بەژنت وەکوو ئەلعانە خەریداری نەبوو خۆ
زوڵفت بەڵێ رەشمارە، وەلێ ژاری نەبوو خۆ
کڕیاری نەبوو، شێتی نەبوو، هاری نەبوو خۆ
ئەو خاڵە رەشەو کوڵمە گەشەو چاوە بەڵاتە

✧ ✧ ✧

زامی دڵی مەجنوونە. لە لەیلێ بووە ناوی
رسوایی فەرهادە، لە شیرین بووە قاوی
سووتانی مەمە زینی گەیاندۆتە هەتاوی
ئێستەش کە ئەتۆ دارەگوڵی خەڵفی رواوی
خوێنی منە خونچەی دەم و زەڕ بەرگی گەڵاتە

✧ ✧ ✧

کامە وشەیی جوانە نەما، راوی نەکەم بۆت
کوێخای قسە بووم، خۆم و قەڵەم بووینە سەناگۆت
حەتتا دەگەشامۆ بە درۆت، سوێن بە دو ئەبرۆت
بانەشکێ دڵی، لێوی درۆ وێژی جەفا جۆت
پاداشی (عومەر) چی بووە ئەو پەرت و پەلاتە؟!

# سەحەر چاوت هەڵێنە

بە دڵ فەرهادی شیرینی وڵاتم من
دەمێ شیرین دەمت بێنە فیداتم من

لە بەحرو بەڕ بە پیت‌وفەڕ، بە هۆی باوەڕ
گڕی عیشقم، لە تۆرەی خۆر هەڵاتم من

لە سەرڕانی بە هاران دائەنم سەر، با
خووا دەرفەت بدا، خزری هەواتم من

لە مەیدانی وەفا چەوگانی ئیمانم
سەری دژمن رفێن عەینی خەباتم من

کلیلی رەمزی قوفڵی مەکری شۆفارم
بە ئەمری لێوەکەت پەیکی نەجاتم من

دەزانم خوێن مژینە بەزمی خوێن خۆران
لە بە زمێکی وەها، ئاوی حەیاتم من

لە نەسڵی هابلم، قابل نییە قابل
ئەگەرچی بمکوژێ دەفعی بەڵاتم من

لە کیسەی چلکی مێشکی زاڵمم داوە
بە پیکی گیان و دڵ، کاوەی وەفاتم من

ئەمن سـەنگی سـەبوورم کـۆشکی بـەردینم
به مـەردی تـاکـو دەمـرم قـرچـە پـاتم مـن

سەحەر چـاوت هـەڵێنە شـەو درەنگـە خـۆ
لە مـێژە مـەحتەلی باکەی سـەباتم مـن

دڵـی تـەنگە کـچی خـونچەی خـەیاڵاتم
وەرە بـا پـێکەنیٚ، تـۆ خـوا، تـەماتم مـن

بە خەتتی ئارەزوو (کۆلیل) ئەنووسیٚ بۆت
کـە تـۆ ئـیحسانی مـەحزیتو، گـەداتـم مـن

سـەرنجی چـاوی پـڕواتـەی هـەتیوانـی
رەش و رووتی، بەرەی کوردی دێهاتم مـن.

سەقز - ١٣٦٥ی هەتاوی

# غیرەتی شیعرم

ئەی ئەوەی چاوت لە پێخەی شەم بڕیوە، غەم مەخۆ

خۆر لە ئاسۆی چاکەوە هەڵ دێ بە چاکی، لە من و تۆ

مانگی کەنعانی لە شاری میسرەوە هەڵدێ لە نۆ

شاپەڕی جبریل دەبێتە مەڵهەمی زامی بە سۆ

سەر مەنێ سەر سەر، هەتاکوو سەر نەنێتۆ بێ مهۆ

کێ لە پا دڕکی دەرێناوە، بە کلکی عەقرەبێ

سا وەرە غەم بۆ ئەوەی نابێ کە جێگەی وەقرە بێ

جارو بارە چۆلەکەش، بۆ بەرهەڵستی سەقر ئەبێ

گوڵ بە کۆڵی خارەوە گەر دابەزێ، بێ وەقر ئەبێ

چاکی پاکی، جێگە رەقسە و شوێنی کەوشی هات و چۆ

تا کەناری کەف نەبێ، نیتە لە دەریادا بەشێ

تا نەدەی پەپکە لە پای خاڵێ، وەکوو زوڵفی رەشێ

چەشنی لەولاوێ نە ئاڵۆزی لە باڵا، سەرکەشێ

تاکوو شەش دەر خاڵیە، هەوڵێ نەدەی بۆ دوو شەشێ

نەخشی هەیوانیت و نیتە شوێنەواری هەست و بۆ

گوێ بە دەنگی سۆزی من دە، باغەوان! کاتی قونووت
با بنیتە بینەقاقای بوڵبولاَن، پەنجەی سکووت
غیرەتی شیعرم، بە بەرقی روومەت و شمشێری رووت
غەم دەکاتە ئاوی ژین و ژین ئەکاتە ژەقنەمووت
یەک هەناسەم داغ ئەکا، پۆزەی زل و لووتی درۆ

بەردە فڕکێ با بکەن گیانم رەش و شین بێتەوە
بەرگی پیرۆزە بە بالاَما، بەلاَ ببڕێتەوە
من کە ئاور فوو لە سینەم کا، سەری دەخولێتەوە
با چلێکیش چێ بە چاومدا.گوڵێ دەڕوێتەوە
ئـەم بـیـابـانـە دڕووی نـادا لە دامـانـی هەڵـۆ

✣ ✣ ✣

# مەراقم لە دڵە

چـــارە نـــەیهێشتوە دەســـتم بـــە بـــەهارێ بگـــەیێ
کـــەڵکەڵەی پـــڕ لە گـــڕوی تـــاسە بە یـارێ بگـەیێ

دەسـتی ئـەوداسـە شکـێ، وا درەوی گـوڵشەنی کـرد
تـــووڕەیەو زیـــزە لەوەی بـــاغی هـــەژارێ بگـــەیێ

روومـــــەتی بـــێ ڕەمـــەقم زەردە، مـــەراقـــم لە دڵـــە
تـــووری ســـینایە ســـەرم خـۆزگە یـە نـارێ بگـەیێ

چـــێتە پـــێشوازی ســـەری تـــیرەوە چـاوم رەحـەتە
نەک بـە چـاوی سـەحەرا، گـەردوو غـوبارێ بگـەیێ

ون دەبێ خوێن لە رەگم، چـی دەچـمە خـۆمەوە مـن
خـوێنە خـوێمە خـوێنەکـەم، تـا بـەنە یـارێ بگـەیێ

ئـــاخر ئـەی گـیانی تـەماشای بـەزەیی، کـوا بـزەیی؟
کـــابەکـــە چ نـــابێ کـــە بـارێ بـە هـەوارێ بگـەیێ

چی دەوێ گەر شەوێ کۆرپەی سوحی رووناکی ببێ
شـەقڵی شـەو بشکـێ لە پـڕ، شـۆڕە سـوارێ بگـەیێ

لەوگـــــرێ کـــــوێرە دراوە لە دڵـــــم ژێـــر و بـــزان
دیـــلە، مـاوە، هـەروە مـاوە، شـێت و هـارێ بگـەیێ

بـــاوی جـوامێری بـە سـەرچـوو وڕو واقـن فـوقەرا
لانـــی کـــەم بـــۆ تـــەمەنی چـــاکـــە، پـلارێ بگـەیێ

چۆکە چووکێ بە سەر ئەم عەرزەوە هێلانی نەبێ
بۆ چرینی کەمەنی ژینی، تەواریێ بگەیێ

کسپە کسپی دەمی دووری پەڕی کردم بە تەمام
بۆ شکۆی دەردی ئەوین بازی شکاریێ بگەیێ

بۆیە نالەم هەیە ئوستادی شیعر نیم و نەیم
شین و هاوارمە، با مەست و خوماریێ بگەیێ

هەر بە رۆخی چەمی دەم پڕ لە هەرای سەیلی سرشک
بێ پشوو پیاسە دەکەم، بەشکە بواریێ بگەیێ

زووبە ئەی گیانی ئەوین، سینەوەکە بێمە پەنات
ئاوی نیسانی بە قا، بابە ئەیاریێ بگەیێ

دڵ بە گۆشەی نەزەری سووتە دڵان دێتەوە حاڵ
خوێن دزێتە گوپی وەک دەنکە هەناریێ بگەیێ

رۆژهەڵاتیم و حەقی خۆمە ئەگەر زوڵفی شەوار
ڕێ بدا تاوە هەتاوێ بە نساریێ بگەیێ

ناهومێدم مەکە ئەی خاوەنی هیوا، بە هیوام
فێنکاوێ بە دەمی وشکە پوواریێ بگەیێ

کازیوەش دێتەوە، بەو مەرجەکە ڕێی پێنەگرن
دەک لە عاسمانەوە بۆ مۆتە شەراریێ بگەیێ

« در پیت گم شدم ای چشمەی خورشید امید »
تون مەڕۆ با نەزەرێکت بە نزاریێ بگەیێ

چاوە بڕکێ مەکە، ئەستێرە لەگەڵ بووکی برین
تۆ مس و نیکلی، با هەژدە عەیارێ بگەیێ

ئەوگرەی بەر بووە تێم نایەوێ داوێنەگرێ
بانەکێشێ لە سەرم شوڵەوو، شارێ بگەیێ

بحر اندیشەی «کۆلیل» زند موج شتاب
بەڵکە ئاخر لەیەمی غەم بە کەنارێ بگەیێ

سەقز ـ ١٣٧٠ی هەتاوی

## دوو بەیتی

لە نێو زستانی سەردی تۆف و لەرزا
لەسەر لووتکەی چیای کوێستانی بەرزا

پەپوولەی ناسکی شیعری ئەویندار
چ زێڕێکی هەبوو، دایۆ لە قەرزا

# بۆی کەرەمی زولفی شەو

شەو وەکوو تۆ زۆر کەسن، مەستی خەیاڵی خراو
پەردە لە روو لادەچێ، کاتێ کەهەڵدێ هەتاو

بۆی کەرەمی زولفی شەو، بێ سەحەری روومەتت
رۆژی رەشی مەینەتە، بۆ دڵ و هەستی تەواو

رۆژ نەفەسی ئاورین، تا لەبرین بەرنەدا
چۆن لە دەروون هەڵ دەسێ، شەو خەبەری بۆیکەواو
ببڕە بە باڵای دڵم، بەرگی رەشی چوونی شەو
زەخمیە دیداری رۆژ، پڕیە لەتیری دو چاو

لاڵە مەگەر زوانی نەی، باسی شەوم بۆ بکات؟
تاکوو بە شمشێری رۆژ، قڕ بخەمە ناحەساو

جێ لە حیجابێ سیا، شەو سپەرێکی نییە
تا بە دزی رۆژەوە، هەڵ مژێ کوڵمی شەتاو

ســـوح لە کـەمەندی رەشـی شـەو، خـەتەری دیـتووە

شـــانە بــە ئـەڵماسی رۆژ، بـۆیە دەکـا پـرچـنی خـاو

تـــیری کـــەوانـــی شـــەوان، نـــاڵە نـــەبێ چـــینییە

قـــــامەتی رۆژی رەوان، هـــــەقیە دەپــۆشێ نـــیقاو

شـــەو دڵ و عـیشق و خـەیاڵ، چـۆنە شکـاری لەبت

هەرسێ شەوەق رای بـڕین، رۆژ کـەدەسی دایـە تـاو

خاڵێ شەوو کـۆڵمی رۆژ، مـەحشەری (کـۆلیل) تـن

ســـوخرەیی ئـەو جـووتەمو، شـێتی ئـەوینی هـەساو

سەقز ١١/١١/٧٤ی هەتاوی

# بـەهـار

گوڵ بە دەم وا گوڵ بە دەم باوە کەنی
کاو لە کۆشکی هەرەس، رووخا بەنی
تـۆفی زســتان و کــرێوە تـێشکان
تا شنەی مەعشووقی بوڵبوڵ راچەنی

✧✧✧

وا شەماڵ دەنگـی بـە گـەرمی هـەڵبڕی
لەشکــری زریـانی سـەردی هـەڵبڕی
غونچە سرتە سرتی سروەی هاتە گوێ
بــۆیە رووبــەندی لە ســەد لاوە دڕی

✧✧✧

شـەو نـەما هـێڵنج و قـرقێنەی مـژی
زوقم و سیخوارێ، بە داری هەڵمژی
دەستی سیمینی بـەهاری پـێگەیشت
گشتی بۆ کردە جل و بـەرگ و قـژی

✧✧✧

لووره لووری گورگی قات و قڕ بڕا
تەپڵی پیلان و شەڕی سـەرما دڕا
هەوری نیسانێ سەهۆڵی کردە ئاو
لەعلی رۆناوە لەجێی بەردی سڕا

✧✧✧

خوێن لە هەنیەی دەشت و دەر، بەستوویە گۆل
بەحری عەترو، بۆ، ئەدا مەوج و شەپۆل
گەردنی زەرد و سپی بێ گەردی وەرد
دڵ بە پێشوازۆ دەبا، بێ کەوش و سۆل

✧✧✧

بازرەقە و فیشقە دەبەستێ ئاو لە بەرد
وەک بلێ، بەردە بە رۆکی ژین، بە دەرد
لارە پێچی بووکی گەڵباخی لە سەر
ناوە، کەچ، کیژۆڵەکانی شاخ و هەرد

✧✧✧

چاوەکەم، نەرگس بە چاوی مەست و ناز
چاوە ڕێتە، پڕ بە سۆز و هەست و راز
شۆڕە بی، پرچی درێژی، شانە کرد
دارە بەر، بەستی، کەژاوەی یێخە باز

✧✧✧

بەژنی خاشخاشە، نشانی دا قەڵەم
وەزنی ئەشعاری تەڕی بێ دەرد و غەم
تاجی سەوزی، بۆیە فڕداوە لە سەر
تا بکێشێ ئاو لە چاوی، جامی جەم

✧✧✧

تیری بێڵە هەڕ، لە سەر چڵڵەی کەمان
کێشک و پارێزەری، هەڵزو کەمان
سێپەڕە خۆیو کتێوی سێ پەڕی
هەر لە باسی، کەیف و، ئەژماری، کەمان

✧✧✧

ئاغجەواش و کۆڵ و کاشمە و گیاپلاو
سواری باڵی با ئەکەن، پەیکی سلاو
ڕەسمی جەژنانە، لە بەر لووتا بە جووت
پەیک و با، پێکۆ دەبن پرش و بلاو

✧✧✧

زوهرە خۆی داوە لە دەق، بۆ موشتەری
سومبوڵە لوتفی خدر، کەوتە سەری
بۆ دەبیرێ وەک عوتارد، ناکرێ
سەیری نەخشەی، تەونی ئەرزی ئەخزەری

✧✧✧

پیچک و ڕێواس و خوزە و شنگ و چەوان
پەلپە لەشوانە و قەیاخ و گیاکەوان
قُمْ بأذنِ اللهِ پێ فەرموو شەماڵ
کۆلکە زێڕینە سەری بۆیان خەوان

✧✧✧

موشکی تاتار و خەتا، تا ڕۆژی چوون
مووچەخۆری مەزرە باغی و گوڵ کەوون
وەرهەم‌و زامی دەروونی کون کونم
هەر هەڵاڵە هەنگە، ئەیکا تەفرو توون

✧✧✧

دەشت و دەر پڕیڕ لە بۆی هەزوێ و شویت
ئەو دوا نەتبێ، لە جەننەت نادوویت
چەندە لێی جوانە، بەنەوشە، لەچکەکەی
چەشنی جامانەی گەزیزە داچوویت

✧✧✧

قـێز و بـێزی نایـه، بیزاو، سـوێسنه
وەک دەمی باغی (اِرَمْ)، بـێته شـنه
دەسـتی لوقمانی لـەپشتۆ بەستووە
نۆکە چەورەو گوندوڕو وەڵگەڕنە

✧✧✧

فەرشی قالاٌقنگ، لە سەر شیو راخران
خێوەتی کارگی سپی تـیا هـەڵدران
بــێ ژمارە تـیرە بـەرقی پـێ چـەقاو
هەر یەکێکی چل چرای لێ هـەڵکران

✧✧✧

شەو بە شەوبۆیە دەنـازێ بـۆیە شـەو
حــازرە بــیکا لەگــەڵ دەمتا گـرەو
گـەردە بـێتە گـوڵ بـە رۆژا لێـوی تـۆ
شەودەپشکێ عەتری زاری بووکی ئەو

✧✧✧

چاوەکـەم!نـەقڵی کـوفر نـابێتە کـوفر
بــاهەزار شــرکی وەهـا زابـێتە کـوفر
قەت دەمی شەوبۆم نەدیوە وەک دەمت
قودرەتی حەققی پـیشاندا بـێتە کـوفر

✧✧✧

حـاجی لەقـلەق هـاتە سـەر هـێلانەکـەی
بوو بەکێشکچی لەنێو دێ جـوانـەکـەی
چەندە خۆش دخشێتە مل شەودا سەدای
ریـزی شـەستیری دەنـوک لێـدانـەکـەی

✧✧✧

بەرزە هۆهۆو بەربەری جوتێری دێم
ئەو کەسەیوا نووری چاوە و هێزی پێم
ئەو کەسەیوا رەنجی ئەو گەنجی گەلە
ئەو کەسەی وا عارەقی ئەو، ئاوی دێم

✧✧✧

کەوتە رێ، سێروو لە گەرمێن، رووبە یار
بۆ تەوافی کابەتوڵڵاهی بەهار
بەزم و شایلۆغانی گەرمە، بێوچان
گاڵە سەر گوێسوان و گاپۆپەی چنار

✧✧✧

چاوەکەم شاری سەقز مەددولبەسەر
مەشخەڵی نوورە، قەوارەی دەشت و دەر
وەسفی ئەو هەموە سرشت و جوانییە
نایە بۆ من، نافعی مەزهەر مەگەر

✧✧✧

خرمەلەک، تا چل چەمە، شۆڵەی شەمن
یا خورەی هەڵدێرە یا هاژەی چەمن
شەتڵی رێحانە و کەنێرە، دەس نەزەر
وەک سەفی حاجی، لە سەیری زەمزەمن

✧✧✧

جارێ مێلاقە و مەنێ و مێژوەردو لۆ
ئاوی ژین ئاژین دەکا لێی، دوندی کۆ
کانییەکەی مەشهوورە،لووتکەی ناکەرۆژ
وادەمی شیعرم لە وەسفی چوو لە گۆ

سـەد بـە رانـانی لەبۆ قوربانییە
زاکـورروز لەو دورەوە حـەیرانـییە
خۆکەلی خان و بەنەشە و ئاربەباو
ئاڵمەڵوو جوانن، وەلێ ئەو جوانییە

✧✧✧

کۆتە چەرمووی کۆتە رەش داکەندووە
وا کـەوایـێکی ئـەمێستا سـەندووە
شـانەکـانی پـڕلە ئـەستێرە و میداڵ
هەر بە دوگمەی گوڵ بە رۆکی ژەندووە

✧✧✧

بـاخێ بـۆکـانو مـەهاباد و شـنۆ
شاخی کوێستانی گەورکم کـۆ بـە کـۆ
پۆلی گوڵ، سەرمەستی ناز و نیعمەتن
چاوەکەم پەرژینی گوڵ بێ، عەینی تـۆ

✧✧✧

دەنگی شمشاڵی شوانـە دێ لە دوور؟
یا نە: ئیسرافـیلە، لێیدا نـەفخی سـور
گیانەوەر سەر پاکی زیندوو بوونەوە
هەرلە زەڕڕاتی زەوی تا مـار و مـوور

✧✧✧

بـەژنی بـەیبۆن و هـەناسەی عـەمبەران
چەرخی شینیشی لە جەغز و چـەمبەران
تـۆ بـڵێی هـەروا نـەبێ، واتـەی هـەرای
بـەرخ و کـاژیلەو مـەڕ و بزن و بـەران

دەم بووە، عەتر و هەلاڵەی هۆ بە توور
وەک ئەوین گیرا، گەلاڵەی هۆ بە توور
هەستی هەڵبەستم ختیلکەی دێ، هەتا
چاو دەکا لەو خەتتو خاڵەی هۆ بە توو

✧✧✧

چاودە قرتێنێ لە شەونم، تاق و جووت
بەرقی یاقووت و بە رۆکی رووت و قووت
سەحنی شانۆیە بەهاری هۆ بە توور
یا بزەی سەر لێوی دڵدارە، بزووت

✧✧✧

کەوشەنی دیواندەرەـم دۆڵ و دەری
سەد بەهەشتی لێ دەبێتە موشتەری
یەشم و ئاقێق و تەڵا و مەرجان، هەموو
پرپرەی گوارەی گوڵاڵە و بەر سەری

✧✧✧

من بڵێم چۆنە بەهاری ئاویەر
خۆت برۆ سەیری هەواری ئاویەر
بێخ و بنچاخی بەهەشت و کەوسەرن
خورەتاوو لانزاری ئاویەر

✧✧✧

داخەکەم، بەم حاڵەوە جەزبەی نەبوو
مەی هەبوو، ئەمما بە مەی خەم تەی نەبوو
پێت بڵێ (کۆلیل)ەکەت، بۆچی گوڵم ؟
مەتنی حەمدیو شەرحی شیواکەی نەبوو .

سەقز ـ مانگی گوڵانی ١٣٧٣ی هەتاو

## داخێ لە عەکسی خاڵەکەت

کەی دەستی مۆمینی شیعر، چاوی سکڵ خامۆشەکا
کەی مەی مەزەی تاڵی، وەکوو لێوی ئەتۆ سەر خۆشەکا

کێ کەوتە سەر ساجی عەلی، بۆ باجی تاراجی ئەوین
کەی بنجی کنجی منجەمنجی لۆمە چی، دڵ جۆشە کا

کاتی بەهاران هەرگوڵێ گەردن کەچە بێخۆ نییە
لام وایە بۆ بەژنی سەخا، سەر دا ئەخاو کرنۆشەکا

پێم وانییە ژیرانە بێ، کەس بۆ نەخۆشێ نامرێ
بۆ نەرگسی بیماری تۆ، هەر ساغە مردن نۆشە کا

با چنگڕی نینۆکی خەم سەرکوڵمی سینگەم هەڵدڕێ
ئەو چاکەکەی بۆ چاکەکا، ئەم چاکەکەی ڕۆپۆشەکا

ناڵەم بەباڵای هود هودا بۆلای سولەیمان ڕێ ئەخەم
شاری سەبای دۆزیوەتۆ، کیژی پەریم مەڕ دۆشەکا

داخێ لە عەکسی خاڵەکەت، وا بەو دڵەی (کۆلیل)ەوە
بەو داخەوەم دانا سەرم، دانا ئەوین بێهۆشەکا

سەفەر مانگی گوڵانی ٧٥ی هەتاوی

# لەف و نەشری موشەووەش

عـــەزیزم بـــێ تـــەماشاکـــە لە بـــەختی لار و نـــابارم
لە دەردی جـــەرگی پـــڕ زووخ و حـــەزین و زار و بـیمارم

هـــــەتا ئـیـێستێ لە دنـیـادا دڵـێکم بـو، ئـەدی هـیـچێ
دڵـیشم خـۆ لەدەس دەرچـوو، خـواوەنـا چ بێچارم

سـەرم سـوورە بـڵێی بۆچی، دڵەی مـاتەم زەدەم ئـاوا
دەر و دیواری رووخـا، چـی وەهـا کـەوتە سـەر و کـارم؟

خـەدەنگی شـاسوارێکـم کـەوێ کـەوتن وەکـو نـەشتەر
دڵـــی کــون کــردووم بـۆیە ئـەوەندە بـەرزە هــاوارم

قـەرینەی ئـیددعاکـەم حـاڵییەن، رەنگـم بـە شـاهید بـێ
چ پـێویستی بـەیانە، یـا چ مـەخفی کـەم، لە ئـەسرارم

شـعووری شـاعیری بـێچارە گـەرچـی بـێ دەم و زارە
وەلێ ئـەم دەردە بـزووانـی، قـەوارەی شـیعری سـاکـارم

مـەڵێن هـیـچێ مـەڵێ، ئـاخر گـڕی گـەرمی لەدڵ بـەردام
شـەرارە و کسپە کسپ و چـڵ، دەکـا بـەم کـارە وادارم

سـەر و سـامانەکـەم رۆیشـتووە، نـاحەق نـییە بێژم
ئەرێ ئەی بێمرووەت شەڕ بەدەس ئەی شۆخی عەیارم!

ئەرێ ئەی شەمعی پەروانەی دڵە پەرتووکەکەی شێتم
ئەرێ ئەی ئاسکی خۆش رەوتـی ولاّت و شـاری تـاتارم!

ئـەرێ ئـەی قـاتڵی سـەدها جـوانـانی دەس و دڵ پـاک!
ئـەرێ ئـەی بەژن و بـاڵاکـەت، نـەمامی تـازە بەردارم!

گوناح و عەیبەکەم چی بوو چ تـاوانـێ لە دەستم چـوو؟
کـە بـەم جـۆرە دڵ و گـوڵ، بـوڵبوڵیشت دا، لە سێدارم

چ رەمزێ بووەکە دوو ئەبرۆ بە شکـڵی لا وەدەر کـەوتن
مەگەر کوفرە نیگای نـەرگس، وەیـا مـن تـەرکی دەربـارم

بەهارێ بووی بە دەرکەوتی، خەجاڵەت بم گـوڵی کـوڵمت
بـڕی مـۆڵەت، بکـەم شـەرمێ لە بـێگانە، بـە دیـدارم

لە رۆژی مەحشەری خالق، مـەگـەر تـرست نـەبوو زاڵـم؟
بـە یـەک چـاو تـێبڕین کـردت لەسەد لاوە، بـرینـنارم

چ لازم تـیر و تـەرکەش بـوو، چ لازم سـەید زەخـمی بـێ
مەگەر من نیمو بەستەی دوو کەمەندی چەشنی رەشمارم

دەزانـم بـێ مـوبالاتی لە خـوێن رێـژی، جـەلا و هـەر وان
هەموو بێ رەحم و دڵ سـەختن، کـەوا بـوو نـیمە ئینکارم

وەلێ کـاری مـنیشت بـا نـەمێنێ، یـا بـە دوو لێوت
شفایێ مەرحـەمەت فـەرموو، وەیـا بکـوژە بـە یـەکـجارم

دەمـێکە تـەپڵی ئـامانم کـوتاوە تـابیعی مـەحزم
خـەراجـی خـۆم ئـەدم، ئـیتر بـە تـۆچی کـوردی بـێکارم

لەف و نەشری موشەووەش بۆ (عومەر) زوڵمە بـە قـوربانا
وەکـوو بـوڵبوڵ مـەزانـە مـن، ئـەمن پـەروانـە رەفـتارم

چۆلاخ ـ رێبەندانی ١٣٤٩ی هەتاوی

# جوانی ئەوینم

بە بەژن و بە بالاّ، جوانی بە دینم
بەلاّمێ نە ئەونەی جوانی ئەوینم
ئـەی ئەوینم تۆ نەویـنم، مـات و گێژ و دڵ خـەمیـنم

پواری پەڕاوەی پەڕەی دڵ وەریوم
منالّی بڕاوەی لە مەمکەو هەتیوم
تۆ بەهاری، گەر نەباری، پووشی وشکی دۆڵ و شیوم

دەبێ تۆش خوشک بی لەگەڵ سێبەرمدا
کە دێی ڕۆژی شادی، بە دەورو بەرمدا
بۆ هەلاّتن، زیت و ماتن، دەستی خۆشی کەی بەرمـدا

شەمی رووت پەپوولەی گیانی منی کوشت
بەتێخی دوو ئەبرۆت، چ خوێن بوو کە نەتڕشت؟!
تۆ قەساوی، پیر و لاوی، بەر هەقی بۆ عاشقان گشت

پەژارەی هەژاریوشەرارەی خەمی تۆ
قەتارەی سیاخاڵ، لە دەورەی دەمی تۆ
بوون بە خوردم، چونکە کوردم، زۆر رەجاڵم، بۆکەمی تۆ

تەرانەی خەمی تۆم، بە دڵ چەندە چەسپە!!
وەکوو ناخی کەوبارِ، لەگەڵ نەزمی قەسپە
ناڵە ناڵی لێ دەکاڵێ، دڵ نەناڵێ، ناڵی ئەسپە

کە چاوت بە شۆخی، خزایە کەمینم
برِی رەنگی رووم‌و، چرِی تاڵی ژینم
چاوی جادووت لێم هەڵەنگووت، بۆیە ئاواگەرمە شینم

ئەگەر لێم دەپرسی چلۆنی، مەپرسە
کە (کۆلیل) لە دووریت چەنێ باری قورسە
دی مەکە سڵ، چوومە ژێر گڵ، تۆش لەگەڵ گەل بێرە پرسە

کەس‌نەزان قاتەلێوەی ١٣٥٥ای هەمتاوی

# شارەی ڕۆژانی بێکەسیم

ئـــەم وشـــانە وشـــەی نـــوورن
مـــلوانکـەی مـێشک و شـعوورن

پشکـۆی گـەرمی خـۆشەویستین
لە ئـــــاسۆی دڵ کـــــەلەپوورن

کـــۆرپەی لێـــوێ کـە ئـاکـاری،
وتـــوویژ بـێ، بـــە ســـاکـــاری

ئـــەم چـــەن وشـــە هـــەڵقوڵیوەن
لە نـــــاخی گـــــەرمی دڵـداری

پـــێشکەش بێ بـە دڵـدارەکـەم،
بـــە بـــالآی بـــەرزی یـــارەکـــەم

بـــــەوەی کـــە خـــەم ئـــەباتەوە
لە نـــــاخە پـــــڕ پـــــەژارەکـــەم

دڵـــــــدارەکـــــەم دراو نـــــییە
ڕوومـــــەتی ڕەنگ کـــــراو نـــییە

دڵـــدارەکـــەم شـارێکە چـووک،
پـــەرچـــەم و زوڵـــفی خـاو نـییە

ئــــەو شــارەیە تێیدا دەژیــم،
ئــــەو نــەبێ نــەبوونێ پــەتیم

دیـــوانــدەرە شــاری ئــەوین،
شــارەی رۆژانـــی بــێکــەسیم

ژن و پـــــیاوی هــێژا و ژیــرن
هــــەڵۆی رۆژانـــــی نــێچیرن

کـــــچ و کـــوڕی خــوێنەوارن
شـــوێنەواری هــەست و بــیرن

پــیری ئــەوێ دەرسی مێژوون،
بــەو پــیرییەش، زۆر لێ هــاتوون

ئــەستێرەی ئــاسمانی بــڕوان
واتــەی وشــەی تــاریک و روون

دەشت و دەرو دۆڵ و چـــــیای،
دارو و دەوەن گــــژ و گـــیای

وەرد و بــەردو هــەردو و زەردی،
بـــەهەشتی خــوا هــیچە لە لای

تــاقە (هــەوارە بــەرزە)کــەی،
گوڵی سـەد رەنگ و تـەرزەکـەی

دیــــمەنی ســەوزو چــەمەنی
ئــاوی سـڕ وەکـوو تـەرزەکـەی

گەنم و جۆی دەرەتانەکەی،
زوڵفی شنگی سەر شانەکەی

پێ بە ساوای بەهەشت ئەگرن،
دەسڕن چاوە گریانەکەی

جێگەی ئاواتی ئەم و ئەو،
چرای رووناکی نیمەشەو

هەواری پیری (پیر مەحموو)،
ماڵی تەرانەی خاسەکەو

دڵ دەستەمۆی نزارییە
یا ساوڵی گوڵزارییە

بەرگی گوڵی کەندو لەندی،
باڵی قومری و قەنارییە

(گۆلبەن) تەلاّی رەنگارەنگە،
وشە لەوێدا بێ دەنگە

پەڕەی دڵی گوڵی گولبەن،
بەرماڵی نوێژی ئاوەنگە

لە ژێر پرچی شۆڕە بییا
ماچ و مووچی گوڵە و گیا

خەم و خەفەت شەوارەیە
لە باخی (باوە حاجی)یا

بچیە (ئاسیاو)ی (حەفبرا)
گوڵ هەڵکراوە وەک چرا

شەونم چاوە بڕکێ دەکا
لەگەڵ جەماڵی ئاگرا

فەرشی حەریری سەوزەڵە
کە پەلکە مێوی تێکەڵە

بۆ پێشوازی لە سوورەسێو
ڕێک وەکوو تووکی مەخمەڵە

جەهان هەرچی جەیرانییە
ئەوێ جێگەی سەیرانییە

کابەی تەوافی ئاهووە،
ئەو باخ و ئاوو کانییە

دڵدارەکەم پۆلێ چنار،
لەوێ وەستاون بە قەتار

ڕوو لە مەزاری مردووان،
دەکەن نوێژی کوردی هەژار

دڵدارەکەم کەرویشکەیە،
هەڵپەڕکێی گەنم و وێنجەیە

زاری وەتاکی گوڵێکە،
حەوزی مەلەی پەپوولەیە

ئەمانە لەو باخە هەموو،
دەبیندرێتن موو بە موو

لە من خراپتر شێتیە،
کێ دەیبینێ لەروو بەروو

عەرزی (قڕان و یەک شەوە)
دەغڵ و دانی بە رێژەوە

چونکی فەلا ئاودێرییە،
بە دەشتەوە بە لێژەوە

خوایە چەن خۆشە (چۆڕ چۆڕە)
بۆ راوی دڵ، دەس بە تۆڕە

ئەڵێی دەنگی ماچی شەوە
ئاو دەتکێ و شڵپ و هۆڕە

بەردی (کوچک رەش)ی کلە،
بۆ هەر چاوێ پڕ لە گلە

دوکتوری یێرەقانەکەم،
زردە گوڵی (پەلی ول)ە

دڵدارەکەم (بێسانە جاڕ)،
جێی بزن و مەڕ، جێی بارە باڕ

ئەوجێ کە گوڵ ئەشواتەوە
ئاوی شەتاو بە هارە هاڕ

(بــاخی خــواروو) تـا (نســاره)
هەنگ لێی هـەڵدەگـرێ ئـاوباره

دەمــی هــەنگوێن شـیرین دەکـا
ئــاوبارەی هــەنگی ئـەو خـواره

(ســـــاوڵە) بـــــە ئـــاو و دارەوه
(نـاوتەنگ) بـە (گـورگەهار)ەوه

ئـــــەوانـــەی نـــاوی نـــازانـــم،
لەشـــــان لەژوور لە خــــــوارەوه

دڵـــــداره نـــــەشمیلەکــــــەمن
قـەشمەرەی «کـۆلیل»ی خـەمن

بـــــا وس بـــــم ئــــیتر لێـــرەدا
هــەتاوکــەی رەجــاڵی شـەمن

# چییە بۆچی؟

ئەوا شەوگاری تاریکی بە سەرچوو رۆژی رووناکە
لە چۆلی زوڵمدا گوم بوو براکەت هەڵسە ئازاکە[1]

شەمێ هەڵکە لە بیر و باوەڕی پاکت لە بەر پێیا
لە بەر یەزدانە یاگەل، ماڵت ئاوا ماڵی ئاواکە

وەفا با بیدڕێ سینگت، جەفا کون کون بکا جەرگت
لەوانەی گەل فرۆش و پارەپسن، کاکە حاشاکە

ئەوەی ژیرە وەکوو تۆ، دژ بە جاسووسە هەتا ماوە
بە سینەی پڕ لە کینە بەر هەڵستی خێڵی ساواکە

چەنێ چاکە کە چاکی (هێممەت) و مەردی بەلادا کەی
بکەی تیماری بیمار و برینداری کە دڵپاکە

دەزانی مەرهەمی دەردی دڵە زامارەکەم کامە؟!
بە کوردی بۆم بڵێ ئەمما، بە وردی بۆمی ماناکە

---

[1] - نەجاتی بدە

نە هەر ئەورۆ بخوێنی بۆم درۆشمی بەرزی دڵسۆزی
سبەینێ پێم بڵێی خەرجی سەرۆکیم بۆ موهەییاکە

چییە بۆچی لە سەرچی کەس کەسی ناوێت و لێی زیزە
لە ڕێی مەرجی برایی ئەم گرێ کوڵە بەرەڵڵاکە

بە کوێستانی لە زستانی دڵی سەردم، لەشی رووتم
بە گۆچانی خەمی پشتم کە پاڵشتی دڵێ چاکە

بە چاوی کوێری ئەو بابە، لە بۆ رۆڵەی سپی‌پۆشا
بە شانی رووتی ئەو رۆڵەی، لە نێو بیری براو کاکە

بە کۆنی ماڵە کۆنی ئەو مەلا بەدبەختە کوردانە
بە ئاوی چاوی خۆم سۆین، یەعنی ئەو رووبارە روونا‌کە

کە بۆیە باوەڕی رۆڵەی زەمانە کورتی هێناوە
ئەوەی وا چوو بە ژوورۆ خوار و پایینی لە لاخاکە

(عومەر) بۆچی سەرت گەرمە بە سەد جۆرە ئەتۆش بدوە
بە ئەم شیعرە درۆیانەت مەقامێ زل دەسووپاکە

کەس نەزان خاکەلێوەی ١٣٥٦ی هەتاو:

## کەتتانی هونەر

وەرن سەیری تەپەی قەلب و گڕەی زەخمی جیگەرکەن
هەتا مردن بە کوللی لەم نەخۆشینە حەزەرکەن

هەتا ماون لە دنیادا وەکوو من قەت مەبن قەت
رمووزی عیشق و رەمزی عاشقی ئێوە لە بەر کەن

بڕۆن بۆ شاری عێشق و عاشقی کالاّ وە دەس خەن
سەفەر بەم شارە ناهێلێ کە خوسران و زەرەرکەن

بەلێ گەرچی گەلێ مردن لە پەروانە قەویتر
وەلێ پەروانە تەمسیلە، کە تەمسیلێ بە سەر کەن

مەگەر نالێن وەکوو پەروانە وا بە ئەی مەلی دڵ
لە کاتێکا هەوای فێر کردنی مورغی سەحەرکەن؟

هەتاکەی غەفلەتن ئیدی مەی و مەیخانە سازە
لە بوحرانی کوڵی مەستی، کەمێ شۆر و شەرەر کەن

ئەگەر بکوژی غەزا چاکە، وەگەر بمری شەهیدی
چ لەو چاتر کە کفنی تۆ لە کەتتانی هونەر کەن

هونەر ئەورۆ وەفایە و لازمەی شەرتی برایی،
وەسییەت بێ کە من مردم، هەموو یادی (عومەر) کەن

حەسار چەرمووی گەرووس ۱۳۵۴ای هەتاوی

# لە خەوما

لە خـــەوما شـــاگـــوڵی مـــاچی دزی لێـــوم، لە لێـوانت
لە دەستی گرتبوو وەک خـەو، خـەیاڵم جـووتە سێوانت

لە تاریکی شەوی پـەرچـەم کـە تـێ‌پەڕ بـوو خـەیاڵی دز
بە نووری روومەتت، هەروەک پەپوولە بوو بـە قـوربانت

بە ئەو تیاچوونە رازی بوو، کە دەمـدی دووکـەڵی شـادی
لە بـــاڵی هـــەڵفڕینی هـــەڵ‌ئەسا، ئـــەوساتە ســـووتانت

لە خـــۆڵی بـــاڵی ســـووتاوی خـەیاڵی، کـردە بـۆسۆ دڵ
کـــە ســـووتاوت شـــیاوە بـۆ بـرینی تـیری مـوژگانت!!

لە خەوما خەوتبوو کۆرپەی سەرنجی هەر دوو چـاوانـم
وەکوو دوو مەردومی دیدە، لە مـاڵی هـەر دوو چـاوانت

بە گەرمی شەرمی شەهلا نـێرگزت، چـاوی تـەماشا مـرد
لە خۆشی وەسـڵەتا، یـاخۆ، لە تـرسی دەردی هـیجرانت

لە خـــەوما بـــاڵم ئـــاڵا بـوو لە دەوری گـەردنی بـەرزت
گەمارۆی گەردنی دابـووم، دوو زەنگـی، واتـە زوڵـفانت

وەبـــاڵی ئـــاشقی دڵ پـــڕ لە نـــاسۆرم بـــە ئـــەستۆ بێ
ســـەر و ســـامانی دریـــا گـــەردنم، ئـەو کـاتە خـنکانت

لە خەوما چاوی خۆر پڕ بوو لە گل، گڕ بـەر بـووە گـیانی
بە زەردی لەعلی ڕۆممانی و بە گرشەی ڕوومەتی جوانت

ڕقی هـەستا ڕەقـیبت بـێسەر و بـەر بـوو مـەراقـی کـرد
کە بینی وەک (عومەر) خۆر ئاگـری تـێچوو لە تـاوانت

**جونیان ۱۱/۳/۵۳ی هەتاوی**

# خەتتی برۆت

تــــا وتـــم لێـــوی شـــرینە وەک نـــەبات

تـــون بـــبوو، جـــارێکیتر نـــێوم نـــەبات

تــــا وتـــم شـــەوبۆ بـــەبۆ، زوڵـــفی ئـــەوە

کــــەوتە قـــینا لێـــم، هـــەتا رۆژی مـــەمات

تــــا وتـــم جـــارێکی هـــاتم هـــاتو هـــات

بـــۆ نـــەهاتی مـــن، ئـــەدی جـــارێ نـــەهات

تــــا وتـــم ئـــاوی حـــەیاتە خـــەندەکـــەت

تـــووڕە بـــوو. فـــەرمووی مـــەڵێ دەڕژێ حـــەیات

تـــا نـــەجارێ، ســـەد کـــەڕەت گـــردت خـــەتام

تـــا وتـــم خـــەتتی بـــرۆت مـــەشقی خـــەتات

تـــاو لە تـــاوانـــا هـــەڵات و خـــۆی نـــەگـــرت

تـــا وتـــم رووی تـــۆ، ســـنووری خـــۆر هـــەڵات

چـــەشنی ئـــە سکـــەندەر، لەقـــات، ئـــاوی بـــەقام

بـــێخدر ئـــەوئاوە، لێـــمان بـــوو بـــە قـــات

کەس‌نەزان بانەمەڕی ۱۳۵۹ای هەتاوی

## بۆ چ ئاوازێ بڕەقسم

بـۆ چ سـەودایـێ بـناڵی دڵـی ئـێمەی هـەڵەبوو

بـۆ چ ئـاوازێ بـڕەقسم مـنی غـەم لێ جـەڵە بـوو

خـەڵکی ئـەم کـاتە نـیانە لەسـەرا چـم لەسـەران

بـۆیە بـێسان و بـەرەم نـوقمی بـژارو کـەڵە بـوو

هـەستی ئـێمە نـییەتی شـۆری ژۆانـی کـچی نـان

وەرزی ئەم ئەرزە کەبەم تەرزەیە بێ سـەوزەڵەبوو

پـەڕوباڵی قـەوەتم کـەوتە تـەنووری رق و کـین

تاقەتیش لێم وەڕەزە حەوسەڵـە بێ حـەوسەڵە بـوو

مـن رەشـم پـۆشییە بـۆمەرگی بـەهاری هـونەرێ

وەک گوڵی کـاغەزو دەڵـقی لەم و لەو مـامەڵە بـوو

کەوتە نێو بـاغی زمـانم بـنە وشکـەی وتـوو وێـژ

شیعری کوردی کە نەچیرێکە دوچـاری تـەڵە بـوو

والەبیر چـوونەوە دەسـی لە مـلم کـردوە خـۆ ش

قات و قڕ کـەوتە جـەمی چـم لە دلا کـەڵکەڵە بـوو

وەسفی تامینی درۆو خزمەتی دەرمان و دەوای
وەک تەمای عیشقی منی سادە بە ئەو کیژەڵە بوو

بووم بە (کۆلیل)ی قسەی خۆم و،بزەی لێوی قەڵەم
کۆرپەکانم لەڕولاوازی دەمی کیسەڵە بوو

سە قز پوشپەڕی ۱۳۷۳ای هەتاوی

# لە سێبەری خەما

هـــەواری دڵ، بـە هـۆی چـڵ و کـولۆ، تـەپی
خەزانی خـەم لە سـەر بـەهاری گـوڵ سـەپی

بـــــــڕاوە داری ســــێبەرم بـــــەری وەری
پـــــەری شـیعر کـــرا بـــەری، لە ســێبەری

شـــــەوارەمـــــە؟ وەیـــا لە چــاو غـــەوارەیـــە
هـــەرچــی هـەیە، هـەتاوە، هـەیڤە[1] ســارەیە

تـــــێر و تـــــەسەل بـــــەزامــــەوە، تــلامەوە
نــــــەبەستە بــــــزمەتە[2] بــــرین، کـــولامەوە

لەبـــــەر جــــــەماڵی شـــەونمی زەردەگـــــەلاَ
ڕوومـــەتی بـــووکی مـــێشکمم ئـــەدا جـــەلاَ

لە پڕ بە گوڕ رفـاندی لێم، سێحری حـەلاڵ
ئێستە شـەلاڵی یـەک خـەمین، مـن و خـەیاڵ

مــــــەرگ بـــــە نــــینووکی دڕی، هـــەڵیدڕی
ئەوکی[3] وشـەی ئـەوین، لە دڵ شـڕی بـڕی

لە مـــاڵی هـــەر دوو چـاوما، بـوو بـە شـەتاو
سەرنجی حـەسرەتم، لە دووی گـوڵی هـەتاو

---

١- هەیڤ: مانگ.
٢- بزمەتە: توێژی سەربرین.
٣- ئەوک: ناخ، قوڕگ.

تیری برووسکه هەر لە نوک هەتا پەڕی
لە دڵ بە خێرایی برووسکە تێپەڕی

ئەوەی بە دەنگی شیوەن و بە ناڵە ناڵ
سۆزی رژاندە گیانی نەی، گڕ لە شەماڵ

ئەوەی کە سەلماندی، بەبێ، رەپ و رەوان
کە زەردی دەردی گەل، زەردە، نە هی خەزان

ئەوەی بوو بە پەپوولەکەی شەمی گەلی
لەتەقتەقی رەقی رقی رەقیب شەلی

ئەوەی لە تاوی بێکەسی تواوەوە
سەری لە سەر سەرینی خەم ئەنایەوە

ئەوەی نەشەی بە (سروە)دا دەمەو بەیان
بە کیژی گوڵ سروودی بولبولی گەیان

ئەوەی هەڵۆی بەرزە فڕی بە هەڵمەتی
کەوبوو، لە نێو چنگی وتەی بە هەیبەتی

وەیانە، هەڵمەتی هەڵۆی بەرزە فڕی
نەگەییە سەتوەتی وتەی گەرم و گوڕی

ئەوەی پڕ بە دەمی نەڕاندی بۆ بەشی
خوراوی، قەومە کۆیلەکەی سەر بە هەشی

غەنیم [١]ی مەرگی هاتە سەر،گیانی تەزانـد
گەلاّی مێرگی گـولاّن شـەونمی هـەڵوەرانـد

دەسـتی قـەڵەم، قـەڵەم کـرا، کـوڵمی رنـی
بووکی ئـەدەب، لە گـوێنی جـەرگی هـەنجنی

(نـالی) لە هـەندەران، لە (ئـوسکودارە)وە[٢]
لە چـاو گـەوهەر و دوڕڕی کـەوتە خـوارەوە

(نـاڵەی جـودایـی) هـێمنی بـەژانـەوە
بـۆ حـاجیە غـەریبەکـەم گـەڕانـەوە

لەم و لەوی بـە (مـەولەوی) درا خـەبەر
هـێمنی وا نـەما، لە نـێو شـیعر و هـونەر

دەروونی (گردی مـامە یـارە)[٣] گـردی گـڕ
چ نـێو دڵـی پـیری نـەمر، چ بـەردی سـڕ

کـوژایـەوە وەجـاغی (سـالم) و (ئـەدەب)
پشـتی شکـا (وەفـایی) لە زیـدی عـەرەب

(گـۆران) لە گـۆڕانـی چـەرخ لە گـۆڕەوە
راچـڵەکـا، بـە گـۆرانـی شـەپۆڕەوە

تـەقەڵدرا، لە لێـوی بـێ کـەسی کـەسم
(نـاری) و (قـانع)ی زەمـان چـوو لە دەسـم

---

١- غەنیم: دوژمن

٢- نالی و حاجی قادری کۆیی لەوێ نێژراون

٣- گڵکۆی (پیرە مێرد) لەوێیە

(سواره) شۆڕەسوواری جوانە مەرگە بوو
یەک بوو خەوە بەردینەکەی، گەڕا بە دوو

بە هارییەی (زاری) و (زیوەر)م لە سەر
مەیتی ئەویندارى گولاّ، مات و پەکەر

بە سەر لێوی (هەژار)مۆ بوو بە سەهۆڵ
ماچی کچی قسەی جوان و نەرم و نۆڵ

لێوە لەرێیە گەل، لە سێبەری خەما
ڕەنگی گوڵی (ئاوات)ی کامیلم، نەما

لە سینگی (خاڵەمینە) مینی دڵ تەقی
بە پێی جەرگی (حەقیقی)یا دڕک چەقی

(هێدی) وەکو (کۆلیل)ە هاو فرمێسکی سوور
لە سەبرەوە دوورە دڵی، پتر لە دوور

هۆنەرەکان، (شپرزە) حاڵ و سەرکزن
هەموو وەکوو مەلا غەفووری حافزن

وەلێ چارەنییە: شوکری خودا مەگەر
ئەجەل تیغی بڕایە، هەرکە هاتە سەر

نەمردووە کەسێ کە پەسنی[1] مێژووە
بە تایبەتی ئەوەی بە زاری خۆ دووە

---

١- پەسن: پەسەند

خوا بە تیشکی ئاوی چاوی ئەو گەلە
لە گۆمی ئەشکیا، کەوتە باسکە مەلە

ئەوەی بە سەخڵەتۆ ژیا لە مێژەوە
کە ئێستە گۆڕەکەیشی وا بە لێژەوە

ببەخشە تۆبیو موحەممەدی ئەمین(د.خ)
سینە بریندار ی خەمین، دەم بە دەمین

هەتا نەچێ لە بیری مێشکی کوت کوتم
قەڵەم، بە ئاوەزێکەوە بە گوێی کوتم

بخوێنە بۆ ساڵی چەقینی گوڵ، لەگەڵ
«خەمت نەبی هێمنە وا لە ناوی دڵ»[1]

**سەقز مانگی گوڵانی ١٣٦٦ای هەتاوی**

١- ئەم لا شیعرە دواییە بە حیسابی ئەبجەد، وە رێنووسی کوردی، دەکاتە ١٣٦٥ کە هێمن لە قاتە لێوەی هەمان ساڵا کۆچی دوایی کردووە.

## «پێنج خشتەکی لە سەر هۆنراوەی مەلا غەفوری حافز»

### خەلفی چنار

دەردم نەیەکێکە، نە دوە، تا نەهەزارە
رۆژ و شەو و عاسمان و زەویم گشتی نەیارە
بەم حاڵەوە هەر خۆت بڵێ تۆ خوا ئەمەکارە
ئەو بەژنە لە بارەت کە دەڵێی خەڵفی چنارە
بەو پرچە درێژانەوە لێم بۆتە قەنارە

* * *

ماسی دڵەکەم دیلە بە توورەی وەکوو تۆڕت
ماسی جگەر و سی ـم و کران زیندە بە گۆڕت
من چش کەوی کەوتووی کە لە لای هەڵمەتی پۆڕت
زنجیرەیی سینتۆیە مەگەر پەلکەیی شۆڕت
بۆ گرتن و خنکانی گەلی کوردی هەژارە

* * *

شۆڕ بۆتەوە دوو ماری سیا چێرە لە کۆڵت
بۆ گەستن و چاو بەستنی دڵداری کوڵۆڵت
ماڵم هەقە حەق‌کوژ نییە وەک مەیلی سەهۆڵت
بۆ کوشتنی تێکرایی چ چالاکە مژۆڵت
لەم خەڵکە کە چەوساوە لە ژێر باری پەژارە

* * *

ئەو خاڵە رەشە قورسی سیانوورە بە بەیتۆ
خۆیناوی دڵی کۆیلەیە پەنجەی بە خەنەی تۆ
ئامپوولی لەخۆ چوون و خەوە، زەردەخەنەی تۆ
وەک بەندی قزلقەڵعە دەچێ چاڵی چەنەی تۆ
هەرچی چو بەشی جەزرەبەیە، قەمچیە، دارە

* * *

سیخۆری سیا وادەوو، پەیمانی درۆتە
کەم نین بە درۆ ، ئەو دەس و پێیانە لە کۆتە
بێ‌وەی نییە کەس لەم شەڕی تالاّن و بڕۆتە
ئەگریجە کە فەرمان بەری ساواکی برۆتە
دیلی دەسی ئەو روو رەشە، زیاتر لە هەزارە

* * *

سوبحانەتە جەرگی من و دڵ بابەتی شێوت
خوا رازقە ئەمما بە ئەمن کردی بە خێوت
نانا نە ئەمن گیانی هەموو، وان لە گرێوت
کێت کوشتووە وا شاهیدی خوێن خۆریە لێوت
نینۆکی دەسیشت کە بە خوێندا چووە دیارە

* * *

تاو تاو بە کەزێ داو دەنێو، تاوێ بە چاوت
کێ کوردە ملی وردە بە دوو زوڵفی شکاوت
بڕیاری برۆتە نەبرۆ، تا زەجە لاوت
تۆزێ بە زەبیت نایە بەوانەی کە لە تاوت
وێڵن لە دەرو دەشت و جێیان کێوو نزارە

* * *

## «پێنج خشتەکی لە سەر هۆنراوەی مەلاغەفوری حافز»

## خەرمانی خەم

ئەو عەرعەری بالاّتە، چ بەژنێکی تەریکە !
ئەو خاڵە لە رووت چین؟کە دڵی پێوە خەریکە !
گیان نووستوە یا مردووە سادەی، خەبەریکە
ئەی جووتە مەمت، عەینی هوڵوی تازە فەریکە
فـێداری دەسـی تـۆیـە دڵـم، چـارەسـەریـکـە

خەرمانی خەمی پرچەکەتم ئافەتی رووتە
شەوگاری رەشی کەزیەکەتم هاوەڵ و جووتە
ئەوباڵی منت وێ نەکەوێ، رەش وەکوو مووتە
گیان بۆتە پەپوولێک و لە دەوری شەمی رووتە
تـا بـاڵ و پـەڕی پـاکی نەسـووتـاوە، دەریـکـە

زستانی لەشم سڕسڕە، تێدا نییە بووژێ
گۆڤاری وتەم بێ تەوەژەو، بێ گڕی سووژێ
هەر تیری مژۆڵم بەسە، لێو لێم دەکورووژێ
چاوت کە بە هاوکاری برۆت خەڵکی دەکووژێ
ئەگریجە لە پای چی،لەگەڵ ئەو جووتەخەریکە؟

ئەو خاڵە لە رووتە، دڵی مێخەک دەشکێنێ
پەنگاوی بزەت بۆوە دەبێ خۆر دەمی لێ‌نێ
کەی قیمەتی تۆ زێڕ و تەلاّ و دوڕ دەری دێنێ
دژمن دەیەوێ تۆ بە تەلاّ هەڵ خەڵەتێنێ
یـا جـوابی بـە تـێلاّ بـدە، یـا جـارێ کەریـکە

لەو رۆژەوە تۆم دی دڵەکەم شیوەن و رۆیە
وەک چۆلەکەیێکە، کە لەنێو چنگی هەڵۆیە
دڵ رەق مەبە، تانەشکی، کەرەم عەینی شکۆیە
ئەم شاعیرە بێ‌چاوە کە سەوداسەری تۆیە
تاوێ وەرە دەس بـاوێ ملـی بـەختـەوەریـکـە

## میوانێکی نوێ

مامۆستای دەرسی هۆشیاری و زانـین، ویێڵ گەردی شاران
لە رێگەی کوردی بێبەش بوو لە ژین، دڵ گەستوی ماران

هـەژاری هـەژار، بـۆ هــەژاری گـــەل، تەمەن لە دەس چوو
ئاسکی دڵ ناسکی سەر باسکی ئەمەل، دەست و پێ شەل بوو

کــوردیت و کـوردم رووتـم نـەدیوە، چونکوو هەژاری
لە مــــێژە کــۆرپەی وەفــا هــەتیوە، لە کوردەواری

هاتوو کەسێکیش وەکوو تـۆی هـەژار، وەفای بە خێو کرد
لەرووتان دووربێ هەزار هـەزار جـار، لە ترسی خێو مرد

هەرچەن دەترسم خـۆیشم لەو خـێوە، بەلاّم بە هەر حاڵ
مـــــنیشی هـــێنا، بـــەریزی ئـێوە، گەرمی ئەشکی ئاڵ

ئـێوە کــە هــەوری بـارانـی بـاس و بووکی هەڵبەستن
هــیواو مــەبەستی مــنێکی کـــاس و دەستەی بێدەستن

رجـــایە وەک مـــن مـــیوانـێکی نـوێ پێشەل و ماندوو
لە چـــۆڵ و دۆڵــی ســـەفەری بـێ‌ڕێ ژیان دۆڕاندوو

بـــــحەویتەوە بــــە پشـــــوودانــــێ، به فێنکه ئاوێ
بــــە چــــاوەدێری هـــێزا و لێزانــێ، له ناتەواوێ

گــەر بــە هــیوابــێ دڵــۆپێ وەک مــن نەبێ به بوخار
خــۆی بــهاوێژێت لە بــەحرێ بــێبن ئەبێ،وەک هەژار

تــــا لەنــێو بــەحری بـیر و بــاوەڕێ، به پیت و رەوا
هـــەر تــەڕ بــمێنێ لێــی هــەڵنەپەڕێ، هەناسەی هەوا

وا دڵـــــۆپێکت لە فـــــرمێسکێ گــەش، لە چاوێکی تەڕ
وەک دیاری شوانێ پێت ئەکەم پێشکەش، بە هەست و باوەڕ

بــــە کـــــاسەلێسی لە ئـــەم و لە ئـــەو، دیوانێ کەم ڕەنگ
بـــێ دێـــڕو گــێڕو بــێ بــردو بـــرەو نە شۆخە و نە شەنگ

دەنــــێرم بـــــۆتان، مـــــامۆستای زانـــا هەڵبەستی زانین
کــــوردێکی پــەتی، بــە وشــە و مــانا، بە وتە و نووسین

(عومەر) بـابەس بێ ئـەم بـەیت و بـاوە نەوا ریا بێ
«گەرمیان و کوێستان هـەر دڵ حـەساوە»، ئیتر کۆتا بێ

## وتو ویژی من و تاقەوسان

ئەی تاق بێدەنگ، تاق وەسسان و بەرد

زمانی مێژووی چەرخەکەی چەپگەرد!

جامی بالاروان، تەواو نوێنم!

خەزێنەی پیری، حەکایەت خوێنم!

پشتت بەرزۆ بووی تۆشەو تێلانە

بەردی سر لە لای ئەم چاوخێلانە

سەدای پای مێژوو تیا تۆمار کراو

ناڵەت دەبیستم، بە گوێچکەی دوو چاو

ئەی بەردە نەخشی، نەخشاوی نەخشاو

قانوون نامەکەی غوربەت پێ بەخشاو

گیر م لە مۆری سکووتی زارت

زارم بە نەغمەی نەخش و نیگارت

ئەو شۆڕە سوارە مەردە بەردینە

تەلەسمی چاوی، شۆخی شیرینە؟

یــــا خـــۆ عــازمی شــەڕ و نەبەردە
لە حــاستی دژمـن ســەختە و لە بـەردە
ئــاخۆ ئـەسپەکـەی ژێـری شـەو دێـزە
خۆی شای شیرین کام، لە شەکەر بـێزە؟
یــا رەخشـــەو رۆســەم بـە هـەڵەداوێـن
دەچـــێ بـــۆ مـەیدان شـێری تـۆڵەسێن

* * *

ئـــەی تــاقەوسانی بــە تــاقەت و تــاق
بـــێ وتـوویـژی پــڕ قســـەو نــەتاق
بـــدوە لە گـــەڵما، پـــیری پـــڕمایە
هـەر چــەن ئـەڵێن بـەرد دەنگــی دەر نـایە
بـــێژە بــــەوانـــەی وا لە دەوری تــۆن
وا هـەر لە بـیری حـەیف و مـەیلی خـۆن
ئــەگـەر ئـێوەی خــاو خــاوەن بـڕوا نــین
بـێن بــە دۆربــێنی دیــدەم بــڕوانـــین
تــا چــاو و گـــوێتان بـــاز بـــێ لە وێـدا
ســەدای بـەردی رەق هـەڵچێ بـە گـوێدا
بـــەلام تــاقەوسان ئـــەم خـــێڵە کــاسن
زووان و فـــــەرهەنگی ئـــێوە نــاناسن
ئــــەمان گـــیرۆدەن بـــە جـــۆرە دەردێ
لە یــەک نــابیسن، تــا لە تــۆی بـەردێ

وەلێ مــن هــاوار زەمــانم لێت بــیست

قــاقاو پــێکەنین گــریانم لێت بــیست

شـــنەفتم شـــیرین، یــێژێ بــە وردی

تــۆ لاڵــە و تکــای فــەرهادی کــوردی

تــاقەوسانی جــوان، تــا دێــمە لای تــۆ

مــانووم دەر ئــەچێ مــن لە پــەنای تــۆ

فــێنکی ســێبەرو ئــەبرۆی مــێحراوت

ثارەقم   دەســـڕن تــا دێــمە نــاوت

دەفــتەری شــیعرم بــەر ئــەبێ شــینی

ئــاخر تــۆ شــینگەی ئــاسمانی شینی

پــام لە شــوێن نــایە، بــێژم جێو بێڵم

مــنیش هــەر وەک تــۆ بێکەس لە خــێڵم

هاو رازێ نــییە بــێ‌خەوش و یــەک ڕەنگ

هەر کەس شاعیر بوو سەری دای لە سەنگ

نـــەنگی ڕەنگ و ڕۆن کـــڕیارن یــاران

دوور لە فـــەرهەنگ و بـــڕیارن یـــاران

بــۆ تــیکەو پــارە، وەک تــیکەو پارەن

بــە دەوری کــۆشکا، کــەوتە و بێکارەن

* * *

ئــەی تــاقەوسانی گــیانی شیعر و بــیر

ئــەو کــاتەی مــنیان بــڕانــۆ لە شیر

دایکـــی غــەریبی بــاوشی پیاکــردم

بــا هــات و نــاڵەو هــاواری بــردم

زۆر شـــەوان خــەوتم، لە پــای کــێلێکا

جــێیان پــێی نــەدام لە نــاو عــێلێکا

لە لای زۆر بــەردا بــە سۆزی گــریان

دەروونــی عــەرشم بــۆ بــوو بە بــریان

ئـــــەوساتە مـــــن و بــەرد و بــیابان

ئــێستا مــن و تــۆو تــەسویری شــاهان

دەستی سەرنوشت وای نووسی بۆمان

گشـــتی نــەداوە بــە دەســتی خــۆمان

ئــەمما هــاوار و بــانگەشەی ســرشت

لە هـــەر لا بـــەرزە بـــۆ ورد و درشت

* * *

ئـــەی تــاقەوسانی کــەتیبەو کــتێو

ئەی بانگی رەسا پڕ بە دەشت و کــێو

ئــەم رێــبوارانــە دیــل و قــەتیسن

داخـــی گــرانــم دەنگت نــابیسن

لە ســـەر دوو لێــوی بــیری ئــەمانە

یــەخی بــەستووە خــۆری زەمــانە

شــپرزەی بــەڵاو ســەرگێژی هــۆشن

گۆشتی کوڵاوی بە حیرس و جۆشن

چاو لە تەماشای نەخش و نیگارن
گوێ کەڕ لە باس و هەرا و هاوارن
دوورن لە نزیک، نزیکن لە دوور
دەبینن ئەسپ و سوارێکی مەغروور
واقی تەماشای شکڵی خوسرەون
نوقمی هەیکەلی شەودێزی ئەون
من سەدای شەپوور ئەژنەوم لەوێ
حینەی شەودێزم دێنە هەر دوو گوێ
ئەمانە غەرقی فڕکەی نەچیرن
من گوێم لە هاژەی شاپەڕی تیرن
ئەمانە تاجی خوسرەو ئەبینن
من گوێم لە خرنگەی بازنەی شیرینن
جەشنەو دەبینن شکڵ و قەوارە
ئە من دەبیستم دەنگی نەقارە
هەزاری بیرن گورۆی چاوەڕوان
لە زەین و هۆشا وەک بێباوڕ وان
پەیامی زەردەشت لە دەستی شاپوور
دیارە لەمانە ئەویش دووراودوور
ئەمن ئەو لەوحە شریتی گوێمە
مایەی تەسەللای دڵەی بە سوێمە

مـن شـيعری شكـۆ دەژنـەوم لە كـێو

هــەر چــەند ئەمانە نـابيسن لە لێـو

دیدەی شیعری غەم، دیارە چەن زیتە

لە هەر چـاوێكیا دوو گـوێچكە قـیتە

٭ ٭ ٭

ئـەی تـاقەوسانی رووگـەی عـێلی سـەور

سوورەی وەالحـەجەر، حـوجرەی دەرس و دەور

تـــاقت گـــەنجینەی تـــاقی ئـــافاقە

مـــەتنی فـــەلسەفەو شـەرحـی ئـیشراقـە

ئـەو كـانی و ئـاوە، وا لە پـەنای تـۆن

دیـــارە ئـــەسرینی ســـڕ و ساردی كـۆن

هـــەر ئـــاوێ لە پـــای بـــەردی جـــیایە

بـــێشك فـــرمێسكی كـــەژ و چـــیایە

ســـەدای الوداع، ئـــەشنەوم بــە چـــاو

لە هـــاژەی ئـــەسرین واتـــە كـانی و ئـاو

پــێچ ئەدا لە خـۆی، شـینكە مـاری جـۆ

لە داخ و دەردی، كـــوشتەی رەنگ و بـــۆ

حـــوبابی هـــەتیو بـــە شـــوێنی ئـــاوا

دڵـــی ئـــەتۆقێ لە حــــەیف و تـــاوا

دەگـــری بـــۆ وڵات، بـــۆ مـنی بـەدبەخت

بۆ تۆ بەردی رەق، پۆڵاسای گیان سەخت

دەگــری بــۆ مــرۆی، ســڕ و ساویلکە

بــۆ دەمــاری کــوێر بــە هــۆی چــاویلکە

دەگـــری لە داخــی تــوونیەتی کــەویر

بـــۆ بــێبارانـــی وەرزی زەیــن و بــیر

دەگری بـۆ سـووارەی گـەلی رەنـجە رۆم

ئــەوانــەی قــڕیان خســتە ســپای رۆم

دەگــری بــۆ خــەرگا و خـێوەتی وێـران

لەم شــوێنە، کــە شێر پــێی نـەدەوێران

دەگری بۆ شەڕ و سـوڵحی دوای جـەنگ

بــۆ تـۆ کـە زەمـان کـردووتی بـە سـەنگ

بــۆ مــن و هــیوای پــووچەڵم بـە هـیچ

بـــۆ تــێبینینی دیــدەی تـیل و قــیچ

بـــۆ تـــۆ دووربــێنی عــەنتیکەناسان

تـــیکەی عــــەنتیکە بــۆ تــیکەناسان

بـــۆ مـــــنی لێـــڵ و لاڵ و دامــــاوێ

لای بــەردا نــەوێ زوانــم بــەر نــاوێ

بــۆ تــۆ کــە دەرکـی ئـاوەڵای مـێژووی

بۆ کەس و ناکەس جێگای هات و چووی

بــۆ مــن کـە پشکـۆی سـووری خـەیاڵم

دەڕوێ لە کـــۆشی خـــاترەی تـــاڵم

بـــۆ تـــۆ، بـــۆ قـەسری وەکـوو بـلوورت
کـــە شـــەوی تـاریک دەنـوێ لە ژوورت
بـــۆ مـــن و دوو پـای شـەکـەت و شـەلم
مـــــاندوو لە هـــەنگاو بـــەرەو ئـــەمەلم
بـــۆ مـــن کـە راوچـی بـە نـەختێ هـەویر
ئـــەمکا بـە غـەزای سـەر سـفرەی تـەویر
بـــۆ تـــۆ کـــە لاوان پشـــتەڵپشتت چـوون
گشت و کەمت بوون، کرژ و گشتت چوون
دەگـری بـۆ مـن و سـەری سـەر ئەژنۆم
بـــۆ پـــەنا هـێنان بـــە کـــەژ و بـــە کـــۆم
مـــــنی هـــــەژاری ئـــــەفسانە ســـــازێ
بـــــیسەر لە بــــەردێ دەنگ و ئــاوازێ
دەگـــــری و دەخـــوێنێ بـە رۆژی شـەڕما
ســـروودێکی تـــەڕ بـــە گـــوێی بـــاوەڕما
کە ئەی (کۆلیل)ی پـڕ وێـژی سـەر گـێژ
ســـەر ســووڕی تـاق و چـیای رژد و لێـژ
ســـپاس بـــۆ یـــەزدان گـــەیشتی بـە یـار
بـــــە هـــــاو زمـــانێ لە نـــەسڵی بـــڕیار
خـــوا شـــوکر خـۆشی بـانگی لێ کـردی
تـــەوافـــی کـــابەی غـــەمی پـــێ کـــردی

سووتایو برژای، له کوورەی غەما
هەتاکوو دەعیەو دەمارت نەما
بوویتە هاو زمان بەردێکی نەخشین
خاوەن هەستی خەست، تامەزرۆی بەخشین

* * *

ئەی تاقەوسانی دیار و سرپۆشم
(کونجی جێژوانی چۆڵ و خامۆشم)
قەسری شیرینم، شیرینی قەسرم
جەم و تێزاوی، ژمارەی کەسرم
له نێو بازاڕی ئەمڕۆی ژیانا
ئەوین گرێوی بە هەوەس دانا
هەر مەلی عیشقێ، بکێشێ نەفەس
دەیکەن بە دارا و دەینێنە قەفەس
ئەم خێڵە ئەونە پووچ و دەغەڵن
له هۆزی نوورا تۆزو دووکەڵن
مرۆ بەردینەی راستی ئەمانەن
پەیکەرەی کرم و خۆرەی زەمانەن
تینوو بە خوێنی فەزڵ و هونەرن
نەزان لە واژەی پەرد و بەشەرن
تانە و تەشەری لێوی ناجۆرن
دەردی بێدەرمان، زامی ناسۆرن

له ئـــاوی زەم زەم بـــەرکنار و وێـــڵ

بال وپـەڕ ئـەشۆن بـە سـێلاوی لێـڵ

سا پەڵی فڕده ئـەی بـەردی مـەڕمەڕ

بشکێنه سەری شەوی شـوومی شـەڕ

ئاسۆی خۆر هەلاّت رەشـی پـۆشیوه

ئـــێژی کـــه هـــەرگیز رۆژی نـەدیوه

بـــا لەمـــه زیـــاتر، پـەل نـەوەشێنین

هەر کەس وەزیفەی خۆ به جێ بێنین

## وەڵامی تاقەوسان

* * *

ئـەی (کـۆلیل)ی غـەم رجـا بـا بـردوو

ئـەی داوێـنی کـێو بـە نـودبە گـردوو

ئـەسڵی ریـازی، بـەم خـەڵکە وایـە

زەرب و تـەقسیم و جـەمع و مـینهایە

بـۆیە گـرانـی دەردێ گـرانـە،

زەربـەتی شـەستی، زەربـی زەمـانە

دووپات و سێ پات، سەد راو سەد هـەزار

بـۆ بـەش کـردنە لە بـەینی زۆردار

زۆردار و بێزۆر، مۆرەی هـات و چـوون

کـە وا بـوو ئـەسڵی ریـازی هـەر دوون

لە زەرب و تـەقسیم کـێ غـافڵ نـەبێ

روو رەش بـم، ئـەگـەر روو سـپی نـەچێ

راکـە لە دەسـتی ئـەم سـەرما و سـۆڵە

بـڕۆ نـێو ئـاگـر، یـا ببیە شـۆڵە

یـا خـۆ رەقـۆ بـی و بـبیتە بـەردێ

قـورس و نـەبزوێو لە پـەنای هـەردێ

منیش بەم هۆیە سەنگینم، سەنگم
واتە پا بەرجا و یاری یەک رەنگم
لەم تاقە فێربە، مانای راوەستان
مانای چاودێری، بۆ رۆژی هەستان
هەر چی لێرەدا نەخش و نیگارە
حەرفی پڕەنگی قەوڵ و قەرارە
گەلێ پەنایان هێنا بەم کێوە
لە بەریان هەستاو وەستا بە پێوە
کۆشکی ئەشکەوتی پێ عەتا فەرموون
کەڵ و بەرانی، کردە گاو گەردوون
کە چی هەموو چوون، بێ ماڵاوایی
یەکێکیان نەیکرد، گەردن ئازایی
ئەو چەشمەو ئاوەی بیری تۆی بردوون
جامی بەر بووکی زەمانەی گردوون
بووکێ کە هەرگیز نەگەیە ماوا
هەر چاوە رێیە بێ چارە زاوا
کەفی گۆرانی لەسەر دەم و لێو
با سەر بنێنۆ برازاوە بێ شێو
هەڵپەڕینی ئاو بەرگی عبوورە
پێناسەی خەوە ئەو تاق و ژوورە

تـــا مـــن و تـــۆیی دەمـــی وا لە گـــۆ
رەق ئـــەبینەوە بـــە تـــاشی بـــەردۆ
وەخـــتێ کـــە ئـــێمە نـــاوی بـــێتە نـــاو
مـــایەی ژیـــانین چـــەشنی کـــانی و ئـــاو
بـــارانـــی هـــەوری مـــن مـــن و تـــۆیی
بوو بە مـــەزرەعەی کـــەکـــرەی دوو پـــۆیی
شـــای مـــەغرووری رۆم بـــەو بـــارانـــاوە
لە ژێـــر پـــای شـــاپوور مـــلی شکـــاوە
تـــۆمی ئـــێمەیە بـــەهاری هـــەر مـــان
پـــاییزی نـــەمان نـــایێتە ســـەر مـــان

* * *

ئەی (کۆلیل)ەکەی زوانی بـانگ و قـاو
بە مـێقرازی غـەم چـەشنی شـەم قـرتاو
کـاتێ کـە مـەستان بـە قـەستی هـەستان
نـاوی هـاتە نـاو، شـاری چـاو بـەستان
ســەری بـەد مـەستی دریـا بـە تـاشا
ســەر چـۆپی کـێشای هـاواری حـاشا
گـاوانـی گـرتی دەسـتی زبـر و رووش
خۆر بوو بە تیکەی شەوی تار و تووش
لە گـوانـی سـوبحا چـۆڕێ شـیر نـەما
ئـەونە تـاریکی جـەم بـوو لە جـەما

نــەچاو دەبــینێ نــەخشێ لەم بــەردە
نـە گـوێ دەبـیستێ نـاڵەی ئـەم هـەردە
نــاخی نـەی گـردی شـیرینی شـەکـەر
نــاڵەی گــیان ســۆزی لێ نــاییتە دەر
وەک چرای سەر رێ خـەندەی نـووری گـەش
کـوژاوە، بـە فـووی بـاڕەشی روو رەش
لەم ســـــەرزەمینە پــــان و بـــــەرینە
ئــاخری هــەر بـەردە نـوێن و سـەرینە
هەر وەک ئـەمانەی کـە خـەوتوون لێـرە
نـــە یـــەکـــێ ژوورەو نـە کـەسێ ژێـرە
لەم قـــــەبرستانە قـــــوفڵی بـــێدەنگی
دریـــا لە لێـــوی ســـووارانـــی جـەنگی
هەموو وێـنەی یـەک، جـێ رژد و لێـژن
ئێژی تـا ئـێستەش مـەست و سـەرگێژن

❊ ❊ ❊

(کۆلیل) ئەی خەستەی غەمی ئەم و ئەو
ئەی هـاواری بـەرز رێگـردوو بـە شـەو
زۆر لە مـــــێژینەی مـــێژووی زەمـــانە
تـــــۆمارە لە نــــێو ئــــەم تــاقەوسانە

شنەی گۆرانی لە سەحنی هەیوان
لایە لایە بوو، بۆ خەونی کەیوان
چەپکە چەپکەی گوڵ لە باغی لێوان
هەزاران هەزار، فەرزانەی لێوان
دیدەی قەترانی، پڕ لە وتوویژ
زۆری لەم شوێنە کردن سەرعی و گێژ
بێخەبەر لەوەی بەو دیدە و لێوە
دەبن بە داوۆ بە دەست و پێوە
بەرەو شاری دڵ رۆیین بە خەیاڵ
کە چی کالۆ بوون وەک سیحری بەتاڵ
بوون بە نەخشی بەرد بەڵکوو بمێنن
لەو دونیا تۆڵەی قاروون بسێنن
گیان بکەن وەبەر گوێرەکەی زەڕا
لەبەر تاریکی بیر و باوەڕا
زۆر بۆ زڕەی زێڕ، کەوتن بە رووودا
نمروود یان گرت و بەریان دا بوودا
بەڵێ عەقرەبەی سەعاتی مێژوو
هەناسەی ژمارد هەرچی هات و چوو
گوڵ چوو بە تالآن، باغەوان تۆرا
تەرمی خەت و خاڵ بە لافاو شۆرا

راوچــــی پــێکەنی، گــریا کــارمامز
ئەو شاد و خەندان، ئەم مــات و ســەرکز
بــــۆنی رەجــــاڵی هــەڵسا لە تــالار
شــا بــوو بـە کـوچکی رەقـی رۆژگـار
لێـوی نــازاران بــوو بــە کــاسەکـەل
خــــنکا لە گــۆمی ئــەجەلدا، ئــەمەل
بــــڕا زوانــــی لاف بــە تــێغی مــانا
خــــۆشی مـــــامەڵەی بــــەتاڵی دانــا
نزمی بەرزۆ بـوو، بـەرزایـی پـەس بـوو
کراسـی یـۆسف پـارەی هـەوەس بـوو
چــاوی تــەماشای داغ و دەرد و ئـێش
رووانــــی لە زامـان سینەی جـەفاکـێش
تـەنگ و چـۆڵەمەو گـرێ کـۆڵەی ژیـن
بـــوو بـە تـەزوێحی بیر و بـڕوای دیـن
لە دامــانی کـێو هــەڵسا تــەپ و تـۆز
سـەریان لێ شـێوا هـۆزی قـیت و قـۆز
گـیانی سـەرگەشتەی مـەجنوون مـەیلێ
نــەما، گــوم نـەکـا هـەوارگـەی لەیـلێ
گــوڵ لە ئــاو زەنگـی نـازا شکـا پـای
جــۆلاتەنەی داو بــە کــەمەن کـێشای

خـــەزانـــی خـــزان، خـــزگەی رۆژگـار
هـــەتا کـــاول کـــا مـــەڵبەندی هـــەزار
یا خۆ دەر بـێنێ دەسـی نـووکە نـووک
لە ژێـــر سـەر بـەهار، سـەرینی گـڵووک
گـــــێژاو گـــێژیدا تـــەنوورەی دەریـــا
بە ئەو چی کەشتی چی هات بـە سـەریا
دەســـتێ نـەگیرا، تـا دەرچـوو لە دەس
دڵ هـــیوای نـەدی تـا نـەبووە قـەقنەس
کـێ کـوشتەی رشـتەی ئـاوەدانـی بـوو
لەوێـوە بـــەرەو مـــاڵ وێــرانـــی چـوو
ئـــیتر حـــاڵی بـــە (کـــۆلیل)ی هـەردە
یێخەی خۆت بگرە، یێخەی مـن بـەردە
بـــە گـەرمای سـینگی کـۆتری هـەناوت
هـــەڵبێنە هـــێلکەی هـــێلانەی چـــاوت

**سنە ـ بانەمەڕی ١٣٧٤ی هەتاوی**

# بۆکێلی مەزاری دۆستێکی خۆشەویسم

تەزی مەرگی ئەتۆ گیانی تەزانم
لەسەر تەختی ئەوینا، دای بەزانم
دڵێکم بوو گوڵم، گەرم و هەوا خۆش
بە بیّ‌تۆ، ئێستە سەرماکەی خەزانم

جونیان ـ خەرمانانی ١٣٤٩ی هەتاوی

# سەروی تاران

گیانە کەم! ئێستەش بەهاری (سەرچناران)ی منی
تێکەڵی بیری لەمێژینەی بەهارانی منی

گەرچی خۆم بەختم رەشە، سەرخۆشی خاڵی سەوزی تۆم
هەر بە غەوزێ، وا لە (بەغدا)، سەروی (تاران)ی منی

دوو زمانیشم ببێ وەک خامە، حەرفم هەریەکە
گوڵبژێرو سەرتەڵی، رەستەی و تارانی منی

موولەسەرزارم، وەدەربێ، باسی زولفت هەردەکەم
خاوەنی داروتەنافی، سەربەدارانی منی

دەستی چەوری خۆی بە سەرما قەت نەساوی چەرخی کۆن
چون بە فەرمانی وەفاداری گلارانی منی

چی سەری سارای ژیانی عومری را بوردوو ئەدەم
نەوگوڵی دەشتی خەیاڵی، جێ هەوارانی منی

پەیڕەوی فەرمانی عیشقم، عەقڵی بێفەڕ هەر بڵێ
بێخەبەر خۆ تۆ لە خێڵخانەی، هەژارانی منی

بای سەبا، با، لای سەحەر خۆ هەڵنەکێشێ پێ مەڵێ
پێخە چاکی پێخە چاکانی هەزارانی منی

بــۆنی قـــینی کـــنجی ســینەی نــاکــەسان تــاڵی لەدەم
چـــــاوەزارو بـــەرگری، کـــینەی نـــەیارانـــی مـــنی

چـــۆڵە دووکــانی کــەسی، مــن بــۆیە تــا مــاوم ئـەڵێم:
گـــــەورە بـــازاڕی مـەسی! پـا تـەختی شـارانـی مـنی

کــەس نـییە سـۆراغـی دڵ بگـرێ، مەگـەر سێڵاوی غـەم
رەبـــبی غـــەم جـەرگت نـەسووتی! واڵە یـارانـــی مـنی

وشکـــــە ســــاڵی زاڵی پـــیری ئــە وکــی خــنکانم، وەرە!
تـــۆلە شـــێوەی، ئـــاسمانی بـــەختە بــارانـــی مـنی

تـــیری مـــوژگان بـــا لە خـــوێنمدا، بتاوێتۆ، کـــە خـــۆت
شـــارەزای گـــر پـــەو بـــڵێسەی، شـــادەمارانـی مـنی

هـێندە پـێم خـۆشە بـفەرمووی «چـەندە تـاسەت کـردوم»؟
وەک ئــەوەی بــێژن ـ لە زومـرەی، تـاسە خـوارانـی منی ـ

ژەنگ و ژاری نـــامورادی، هــەستی (کــۆلیل)ی پــوانـد
گـیانەکـەم! ئـێستەش مـورادی جـاری جـارانـی مـنی

# کراسی گوڵ

ئەی وەکو شەونم لە هەوای شاخ و بەنەن پاکترا!
ئەی لە دڵی ڕۆشنی ئەم عاشقە ڕووناکترا!

ساوی دو شمشێری بڕۆکەت کە ئەدەی تاوتاو
چاکی دەروونم لە کراسی بەری گوڵ چاکتر

چاوی خوماری مەسی مەستت لە شەراو باتر
لێوی تەریشت لە مەیە، زۆر لە ترێ تاکتر

بۆ گلی دیدەی لە گرێ پڕ پڕە کەم خاکپات
کاری لە دەرمانی حەکیمان فرە چالاکتر

با بشکێنێ کوچکی ئێوە سەرم جارجار
دەستی نەوازش نییەلەو بەردەیە قەت چاکتر

مانگی یو پەنگاوی بزەت پەخشە لە سەر ئاسمان
بەحری سر شکم لە سییا، لێرەوە ساواکتر

لەودەمەوە گیان بووە قەقنەس بەشەمی ڕووت سووت
نەک وەکوو پەروانە لە پەروانەکە، بێباکتر

بێجگە لە فرمێسک و لە تۆقلەی جگری داغدار
چی نییە (کۆلیل)ی لە خاکی بەری پێت خاکتر

## مانگی تۆراو

مامۆستای دەرسی هۆشیاری و زانین وێڵ گەردی شاران
لە ڕێگەی کوردی، بێ بەش بوو لە ژین، دڵ گەستووی ماران

قەیسەکەی سارای پڕ لە نەخۆشی، لەشی دەرد و غەم
گیانی ئاڵۆزاو چون زوڵفی لەیلێ پڕ لە پێچ و خەم

هەزاری هەزار، بۆ هەزاری گەل تەمەن لە دەس چوو
ئاسکی دڵ ئاسکی سەر باسکی ئەمەل، شەکەتو شەل بوو

مانگی تۆراوی شەوی تاریکی بەختی هەژاران
سووتاوی گڕی عەشقێکی سپی بە پاکی باران

پارچە شیعرەکەی چەن ساڵ لەمەو پێش دوو پاتەکەمۆ
گلەی زامانی ناسۆر کەوتەکەم، لە لاتەکەمۆ

چوومە خزمەتی هەورە برووسکە بردم ناوی تۆ
نالآنی وەک خۆی تەواو تواوە، بە شین و ڕۆڕۆ

گۆڕستانێ بوو چاڵ و چۆڵەکەی تەختی تەوێڵت
پڕ لە شەهیدی کۆرپەی ئازادی بۆ قەومو خێڵت

تــۆش لە بــڕبڕەی پشــتی ئـەم گـەلە　　تێکەڵ کراوی
بــــۆیە ئــازیزی لە لای هــەمووکەس　　زیاتر لە چاوی

بــاخەڵت پــڕ بــوو لە هـەوری باران　　بۆ مەزرای ژیان
تا چاو کارئەکـات، کـانیاوی کـوردیت　　ژیانەوەو تەقان

لە مــێژە کــۆرپەی وەفـا هـەتیو بـوو،　　لە کوردەواری
جار جارێ هەست و خۆشەویستی تۆ　　دەبوە هاوکاری

بـــاوانــێکی بــوو، بــاوانــی شــێوا　　هەتیوترماوە
ئـەستێرەی بـەختی بـەرلە بـاڵق بـوون　　سەری گێژیاوە

کەم کەس وەکوو تۆ تامەزرۆی راسی،　　راس بوو لەگەڵ گەل
لە جادەی بەڵێن نـەبووی کـەچ و کـەل　　تاداچووی لەکەل

خۆ بۆ ئـەم چـینە دەس لێ وەشـراوە،　　دەمی عیسا بووی
وەختێ ئاوا بـووی، ئـاوا ئـاوا بـووی،　　بۆچی ئاوا بووی

ئـێوە کـە سـەوزەی بـەهاری بـاس و　　بووکی هەڵبەس بوون
هـــیواو مـــەبەستی مــنێکی کـــاس و　　دەستەی بێ‌دەس بوون

ئـــاخۆ رەوایــە مــیوانــێکی نــوێ،　　بێ شەل و ماندوو
لە چــۆڵ و دۆڵــی سـەفەری بـێ رێ　　ژیان دۆڕاندوو

نــــەحەوێتەوە بــــە پشــــوودانــــێ، به فێنکه ئاوێ؟!
بــە چــاوە دێــری هــێژاو لێــزانــێ له ناتەواوێ؟!

کــێ بــێ نــەزانــێ، تــا ریشــە نــەبێ گەڵاو لق و پۆ
ماچ ناکەن هەرگیز کولمی سپی و سوور رۆڵەی رەنگ‌وبۆ

کــێ بــێ نــەزانــێ دڵــۆپێ وەک مــن، ئەبێ به بووخار
تــا خــۆی نــەخاتە نــاو دڵــی مــەنگی بەحرێ چون هەژار

بــــا له نـــێو ئــاوا بــیرو بــاوەڕێ به پیت وڕەوا
هــەر تــەڕ بمێنێ ولێــی هــەڵنەپەڕێ، هەناسەی هەوا

کــەچی بــە جــارێ لەکــەچی بــەختم دەریا خاڵی بوو
عــاسمان قــووتی‌دا، گــۆیا لەوێشــا وشکه ساڵی بوو

مەگــەر بــە پــرچــی لێــزمەی فــرمێسکا سەرکەوم بۆلات
دەتــرسم لەوێش پــەیا نــەبی بــۆم، نەگەم به ئاوات

لەو دنیا مــەجنوون گــولۆڵەی عــیشقی کەوتبوە لێژی
تۆیان بردبۆ لای کــە خــۆت ئــاسایی دەرسی پێ بێژی

پــەس وا دڵــۆپێ له ئــەسرینی گــەش، له چاوێکی سوور
به دیاری دیــارت دەکــەمە پــێشکەش، سەوزەی ماڵ لەژوور

وەک شیعر و ڕووبار دارو دەشت و کێو، دەریا تاشە تاو
عەرزی ڕوومەتی جەرگم بڕی شێو، بە خوێن بوو کەشاو

بلووری گیانم شکیاو قلمۆ بوو ئاوی ژیانی
سووتا شاپەڕی تەواری گەرووی بەستە و گۆرانی

تۆفانی چاوی فێر خوازەکانت ئەونەی نەماوە
دنیا نوقم کا، لە پاش نەمانت، بەڕووی دنیاوە

تەزو مووچڕکەی پەژارەی دووری بەر بوونە گیانم
شین و، واوەیلاو، ڕۆی لێ ئەچۆڕێ شیعر و پەخشانم

سەنگی سەبووری شەوی بێدوایی کوردەواریم ڕۆ
کۆلکە زێڕینەی جوانی خودایی و بەختیاریم ڕۆ

ئازیز لێواو لێو پڕلە کلپەیە دەروونی «کۆلیل»
زیز مەبە ئەگەر پرسیم گەییە کوێ؟ وادەکەی نەشمیل

مەگەر نەت فەرموو، نەشمیل من و تۆ بێ ترس دەژین
بە یاری یەزدان، منالمان دێتە گەشەو پێکەنین؟

کە نەما تۆوی خوێن مژو زۆردار، دران لەسێدار
دنیا دەکرێتە بەهەشت و گولزار، بۆ پۆلی هەژار؟!

کێ وەک تۆ بێژێ ئیستعمار تینووی فرمێسک و خوێنە
داڵدەی زۆرداری، شوومی شەڕئاشووی لایق بە جوێنە

بۆ هاوارکردن، بۆ هەوڵ و کۆشان، بۆ دەرسی خەبات
بە چینی نەدار، لە دەستی زۆردار کێ بدوێ لەدوات؟!

قوربان ببووره وەڵامم ناوێ با هەروەهاوێ
باوێتر ئەڵێم گوێ بگرە تاوێ لە دڵ سووتاوێ

بەڵێ ئەم دنیا تەونی دەسکردی جاڵجاڵووکەیە
تەمەن لە حاستی خۆری هاوینا بەفرەڵووکەیە

بەڵام تۆ لێوت ئاسۆی هەتاوی بەرەو ژیانە
بیرت ڕەوڕەوەی منداڵی مێشکی ئێمەو مانانە

بە واتەی خۆتان مەگەر زل کوێران مردوو بڵێن پێت
وجاخت روونو پاکە، چون سیروان دایم دەخورۆ شێت

کەسێ گوڵجاڕی شیعری بەهاری لە دەشت و سارا
لەسەر کیژانی شاری مێرگولان ببێ بە تارا

کەسێ پێنووسی، هەتوانی زەین و سۆمای دوو چاو بێ
مەمێ کەزینی خانی پەسەندی، بۆ دڵسووتاو بێ

کەسێ کە خەیمەی داوێن زێـڕینی بوو بە سێبەری
خـــەیامێ پـڕپڕ لە فـریشتەی نـاز، لە حۆری و پەری

کـــەسێ لە بـــاخی بـاس و وتـارا، عەتری کەرەمی
بـــچێ بـــە لووتـی دۆس و نـەیارا، لە زۆرو کەمی

کەسێ کـە پـایە و پـلەی شـەرەفی شەرەفنامە بێ
لە شەرەفکەندی رایەحەی خـۆشی وەک شەمامە بێ

کـــەسێکی ئـــاوا هـەرگیز نـامرێ، نیشتەجێی دڵە
برای شین گێڕی هـەزاری «کـۆلیل» دڵیش لە گڵە

سەقز ـ ١٣٦٩ی هەتاوی

# گوڵی خوێناوی

## یا بەهاری شەست و شەش

ئەڵێن خونچە پێ دەکەنێ فەسڵی بەهار
پێدەکەنم دێم و دەڵێم بە دڵ پڕی

نا دەتەقێ ورگی ئەدا گورگی پەژار
وەکوو ئەڵێن ملی کەچی جلی شڕی

لە خۆرەتاو، لە شیوەلا، بەڕۆڵەڕۆ
پەپوولە پێی ئەڵێ:رەقیب خوێن دەمژێ

بە هاژە هاژی بای خەزان دەچی لە گۆ
جا لە خەمان، ڕوودەڕنێ، خوێن دەڕژێ

چیا بە کوڵ، بۆ دڵ و گوڵ، دێتە گرین
شاخە نەواتی گاشەکان[1] کز و خەمین

بە وسکوتی هەورە رەشەدا ئەتوێ
بە سەر دڵی گڵی بلاتوێ توێ

لە لووتی کێوە بەرزەکان مژ دەپژێ
زوڵفی خەمی لەشان وەکوو قژ دەڕژێ

---

١-گاشە: بەردی زل

دووکـــەڵی تـــەم لەســـەر دڵ و دۆڵـــی کـــپی
عـــارەقی مـــاندوو بـــوونیە ئـــاوی ســـپی

کـــراســی یـــاسەمەن شــڕ و خـــەڵتانی خـــوێن
بـــەیبۆن ســـپی ســـپی دەبـــێ بـــە خـــۆ ئـــەڵێن

بـــە بـــێ تـــەلێ[1] هـــەواڵ بکـــەم لە هـــاوەڵێ
ئـــەلۆ ئـــەلۆ، بـــەنەوشەیە؟! بـــەڵێ بـــەڵێ

ئـــێوە؟! ئـــەمن بـــەیبۆنی پـــای بـــەندەنەکـــان
ئـــەرێ لە لێـــوی جـــۆگـــەلە چـــۆنە ژیـــان؟!

ئـــێمە لەگـــەڵ ســـوێسنەدا لێـــرە کـــزین
پەل پـــەل و مـــل شکـــاو، بە هـــۆی دەستی دزیـــن

تـــاقە لە ئـــەربەبای قـــەراخـــی بـــانەدا
گـــوڵێ نـــەما کـــە بـــا گـــەردنی بـــانەدا

لە نـــێو شـــاری مـــەریوان و لە خـــانەدا
زوڵـــفی هـــەمووی رنـــی، وەک لە مـــیانەدا

لە داخـــی ئـــاخی دایکـــی دڵپـــڕ لە کـــەسەر
بـــە پـــاسی حـــورمەتی بـــاوکی پـــارە جگـــەر

بەهاری شـەست و شـەش لە گـوڵ بـووبە چـەمەر
هـــەر لە هـــەلاڵە، تـــا دەگـــاتە بـــۆعەمەر

---

١- بێ تەل: بێ سیم.

پــڕووزی بــا بــردی هــەڵۆی شــاری ســەقز
گــولاڵەکــانی پــارکی چــەم، جــل شڕ و کــز

چـــونکە لە خـــەڵکی شــارەکــەم دراوە چـــز
بـــە دەســـتی گـــەورە نـــۆکـــەری هـــانی کـە پز

لێـــوە لە ڕێـــمە بـــۆ لەرەی لێـــوی هـــەژار
مـــــەیتی مـــــناڵە رووتـــەکـــەی لێ بـــووە بـــار

هـــەستیەکـــەی گـــەوهەری فـــرمێسکە هـــەموو
ئـــەویش نـــیساری گـــۆڕی جـــوانـەمەرگی بـــوو

بـــاری گـــرانـــی بـــێکەسی شـــانی خـــزان
تـــــەنووری داخـــــی خـــەستەیی هــەڵی کـــزان

گـــــێژە لە بـــەینی بـــیری دەرچـــوونی لە شـــار
لەگەڵ نەچوون، بـە هـۆی نـەبوون، کـاکـی نـەدار

بـــــلوارە وەک بـــــلوورەکـــەم پـــەراش پـــەراش
خـــــزانـــــە بـــــاخەڵی غـــەمۆ ورد و هـــەراش

دلاّن تـــەزی لە ســـەر تـــەرمی بـــە کـــۆڵە بـــوو
تـــــەوەژمی لێ‌بـــــڕا لەشـــــی گـــــولۆڵە بـــوو

بـــە مـــیک و مـــیراژ و ســـوخۆی رووخـــاوە مـــاڵ
بـــە ســـەر لانکـــی کـــچ و کـــوڕی شـــلکو مـــناڵ

ریشـــی ســـپی و قـژی کـولووی پـیری بـە سـاڵ
لە خـــــوێنی ئـــــاڵی کـــاڵی پـــیری یـــا شـــەلاّڵ

پشتی چناری بەر بناری چۆمەکەم
چەمی! وەکوو کەوانی پشتە کۆمەکەم

روومەتی زێد و بوومەکەم، کنج و کەوو
هەڵیگوشیوە تون، دێوەزمە و شەوو

تەپی دڵی (تەپی مالآن)ی خۆشەویس
بە سینگیا چەقی، مووشەکی رووسی پیس

نۆکەری ئاغە گەورەکانی خوێن چەپەڵ
بەر بووە شارەکەم، وەکوو گورگ و چەقەڵ

لە رووی حەمامی شیشە رەنگ و روو پەڕی
هەرکە سەگی فڕۆکەکانی پێ وەڕی

تەوێڵی شیشەکانی پڕ بوون لە برین
دەچوون ئێمە گوڵی بەهار، دانەمرین!

ورد و تریتە مل، لە (گوڵشەن)ی سنە
لە لێوی هەرکەسێ بەزی بزە و شنە

گرین کوتای لە جێگەیا باروبنە
هاوارە شینە، شیوەنی پیاوو ژنە

لە (ئەکبەتان) و (چوارباغ) و (ئاغەزەمان)
وزەی بەهاری پێکەنین بوو بە فوغان

بـه (مـانگی سـوور)ەوە[1] هـەتا هـەتیوەکـانْ
لەکـــاسە دەر پـــەڕین دیـەی دیـدە مـەسان

شـەقامەکـان بـە خـوێنیگەش بوونە هەسان
بــە جـەرگی (تـەربیەت مـوعەللم)ا چـەقی

گـەرمەگـولەی قـەومی درۆ خـێڵی خـەسان
نـۆکـەری گـوێ لەمسـتی کـوفری ئـەفلەقی

لە (پـیر مـوحەمەد)ۆ هـەتا (بـلوکەکـان)
خـواردی بـە چـاوی چـاو چـنۆکـەکـان تـەکـان

دایک لەگـەڵ سـاوا مـناڵی کـرچ و کـاڵ
لە مـەیدانـی (نـەبووەت)ا بـوون بـە زوخـاڵ

شـیوەنی (ئـاویەر) بـۆیە گـەرمە بـە کـوڵ
زیـزە گـزیزەکـانی سـیسە تـۆپە گـوڵ

شـەونمی فـرمێسکی لە شـیو دێ وەکـوو زیـو
شـەریکی مـاتەمە لەگـەڵ دایکـی هـەتیو

زەمـاوەنی گـەڕایـە شـین (زاواو بـووک) [2]
وەری بـەری زەردە خـەنەی بـە نـووکە نـووک

بـەڵێ لە سـابلاغەکـەما، بـوون بـە هـەلووک
دەس و رانـی گـەڵێ رەزا شـرین و سـووک

---

١- مانگی سور: هیلال ئەحمەر.

٢-کێژێکە لە پەنای مەهابادەدا

(یەرغو) بە مەوجی خوێن و کەف غەم دەکرێ
کزە گڵۆپی (چوار چرا) کز دەگرێ

بە بۆمبی خۆشەیی کەوتە باڵەفڕێ
خەڵکی (مەیانی حەیوان)ی هەر لە پڕێ

جامی ئەگەر بمایە بۆ مەیانەکەی
چەندە پەرۆشە ئاسکە جوانەکەی

بە ئاگری گولەی گەرمی بەیانەکەی
سیخ بوو لە چاوی میک و میکەوانەکەی

قەسەم بە شارە گەورەکانی خاکەکەم
بە (تەورێز) و بە (شیراز) و (ئەراک)ەکەم

بە (تاران) و بە (کرماشان)ە چاکەکەم
بە (ئەسفەهان)ی دڵ لە سینە چاکەکەم

بە (شووشتەر) و (قوم) و (ڕەشت) و (ئوروومیە)
بە (زەنگان) و بە (سەردەشت) و (حەمیدیە)

بە (سەڵماس) و (مەراغە)وو (ڕەبەت) قەسەم
بە (بووشار)ی بەری لە چەوت و چەت قەسەم

بە کانی قیر و نەوتەکەم بە (ئابەدان)
بە (دزفوول) و بە (ئەهواز) و بە (دێلوڕان)

(خوڕەمشار)ە عەزیزەکەم بە تۆ قەسەم
یا (هەمەدان)ی شاری گەنم و جۆ قەسەم

قەسەم بە (ئیلام) و (کەرەج) (قەسر) و(شنۆ)
قەسەم بە (میهران) و بە (ماشەهر) و بە (خۆ)

بە سەرتۆپی ولاتەکەم هەمووی قەسەم
خەرِ و چرِ و زرِ[1] و ورِ و دروِوی قەسەم

باغ و چەمەن وشکە لە بۆ رۆڵە کوژاو
قەبری غەمن لە حەسرەتی مێشکی پژاو

لە قرچە قرچی ناوسکی ئاوسی دەرد
رەنگی گولاڵە سوورەکانیش، بووە زەرد

نە گوڵ خۆشە دڵی بە من، نە من بە گوڵ
تیری خەزانی خەم دای لە جەرگی بەهار

بووکی ئەمەل ملی شکا، چوو بە خەسار
لە بولبولان نەزم و هەوای سۆزش و کوڵ

(کۆلیل)ە دڵ لە گوڵ پتر شەلاڵی خەم
حەرفی وشەی رژا بە هۆی جەماڵی خەم

کە درکی تیژی دژمنی چەقی لە دڵ
گوڵیش بە رۆکی خۆی دری لە شاخی چڵ

**سەقز رەشەمەی ١٣٦٦ی هەتاوی**

---

١- زرِ: وشک ـ وریا ـ چوکەلانە.

# سوڵحی ساڵحی و ساڵح

دیدەم دیدارت بوو بە قسمت من
دڵ ئاما وەدەر، لە چاە بێ بن
سوڵحی ساڵحی و ساڵح دووبارە
باغی (سەفا)یان گردە ئیجارە
گلەیی ڕۆژان، فیراق و دووری،
درەوبوو وەداس شیرینی، شووری
یانی شیرینی شەربەتی ویساڵ
مەتای بازاڕی شۆری کرد بە تاڵ

جەنابی مامۆستامەلا موحەممەدی ڕەبیعی لە ساڵی ۱۳۴٦ لەنامەیەکدا ئەم شیعرانەی خوارەوەی بۆ نووسیبووم بەڵام بەداخەوە سەردێڕی نەبوو. منیش لە هەمان کاتا، چەن شیعرێکم بە سەردێڕی (کاری گەردوونە) لەوەڵاما بۆ نارد. ئەمەش دەقی شیعرەکانی مامۆستاکە بێ‌ماوە پارچە شیعرەکەی خۆیشم بەدوایاندا، دێت:

جەنگەن جەدەلەن قەهرەن تۆریانەن
ئینقلاب مەیل، نەشئە گۆڕیانەن
شینەن زاریەن، یەقە دڕیانەن
وەقت و وادەی دەس لە یەک بەردانەن
وەقت تەحەممول جەور دووری‌یەن
مەزاق تەڵخی ڕۆی مەهجووری‌یەن

له لای مەعشوقان شۆرەن شەعەفەن
له لای عاشقان دەردەن تەلەفەن
له لای مەعشوقان دڵ نەوازی‌یەن
له لای عاشقان ئاوات وازی‌یەن
له لای سوڵتانان رەئیەن تەدبیرەن
له لای ئەسیران کۆتەن زەنجیرەن
له سەرای لەیلێ چەنگەن روبابەن
له سینەی مەجنون جەرگەن کەبابەن
له قەسر شیرین شەوقەن شادیەن
له بوقعەی فەرهاد نامورادیەن
له لای مەحبووبان جورعە نۆشینەن
له لای مەحزوونان سیا پۆشینەن
له قەڵعەی لەیلێ پەردەی زەربافەن
له کوڵبەی مەجنون حەسیر ئیسرافەن
شەرتەن تا وەفا نەدەی نمایش
دڵ ئازاد نەکەی، له گشت ئالایش
دیدەی من، دیدەت نەکا تەماشا
چون بێ‌وەفا ئیت، هەزاران حاشا
(رەبیعی) له داخ بێوەفایی تۆ
خەیاڵ کەردەن تەرک ئاشنایی تۆ

٤٦/١١/١٠

## کاری گەردوونە

گەورەم ئەم قارو جەنگ و تۆریانە
ئەم ئاڵ و گۆڕە تاڵ و شۆر یانە

ئەم هەموو دەردەی خوسپە لە پێوار
کەیێخەی سەبری دڕیوە تا خوار
ئەم دەم تاڵییە پەی دەردی دووری
کەدای لە شیشەی ماڵی سەبووری
گشتی لە مەکری چەرخی بێ‌پۆیە
ئەم قرچە و برژە و بۆنی بۆسۆیە
کاری گەردوونە ئەم مەکر و فێڵە
کام سەرای رۆشن؟ کێ سەرای لێڵە
بەخێڵی مەعشووق وەنای نەداوە
عاشق با گیانی بنێ بە لاوە
سینگی دڵبەران دڵ نییەن لە تۆی
عاشق وەکوو مار با پێچ با لە خۆی
هەرچی تەدبیری سوڵتان و میرەن
کۆت و زەنجیری دوو پای ئەسیرەن
تەنوورەکەی چەرخ مەجنوونی سووتان
لە دەرگای لەیلا قەیسی هەڵ تووتان
قەسری بەهەشتی رازانۆ بۆ لەیل
بە مەجنونی‌دا دەرونێکی کەیل
بە وەسلی شیرین خوسرەو ئەکا شاد
تا بنێتە گۆڕ موورادی فەرهاد
شێوەی شیرینی شای باڵابەرزان
تالان کرد کالای کۆکەن بە هەرزان
دای بە مەحبوبان بەزم عەیش و نۆش
رەش پۆشی و مەینەت دا بە من و تۆش

گەرچی بە شەرت و بە شەوق و تاشا
لە یاری بێمەیل فەرمووتە حاشا
بەڵام ئەو کەسەی عاشق بە خاڵە
تەرکی ساحێو خاڵ لەلای خەیاڵە
شەرتەن تا ماوم لە سەر بساتم
تا هەناسەی بەین مەرگ و حەیاتم
کۆڵ نەدەم لە ڕێی عیشق و ئەوینا
مەگەر بەخت و ژین لێم کەونە قینا
(عومەر) گۆچ گردووی ڕۆژی ئەلەستە
لە وێوە بە جام دەردی دڵ مەستە

حەسار چەرموو ١٤/١١/٤٦ی هەتاوی

لەشەوی ٧٥/٦/٢٥ی هەتاوی کاتژمێری ١٠/٥ شەو، لە کاتێکا لە نێو ماشینا بووم، بە بۆنەی مانگ گیرانەوە ئەم سێ شیعرەی خوارەوەم، نووسی.

# مـانگ گـیران

باکوو هەر کەچ بێ لەگـەڵما زەمـان

بم چەوسێنێ تۆ، هەر وەکـوو کـەوان

شەرەفم نادەم بـە سـوفرەی رەنگـین

رازیم بـەدەستی خـاڵی و لەتـێ نـان

تارۆژێ دەردێم لە ژێر خاک و خۆڵ

چەشنی ئەو مانگەی گـیراوە ئـەلعان

## ئیمام شافیعی فەرموویە:

قـــەناعەت ئـــەسڵە لە مـــایە و مـــاڵا
هـــەر بـــەو داوێـــنە، دوودەســـتم ئـــاڵا

کەس نەمبینی لە بەر دەرکـــی خـــۆی
بـــۆ نـــان و ئـــاوی، یـــا بـــۆ نـــانودۆی

هـــەر بـــەم هـــۆیەوە بـــێمال و فـــەقیر
دەگوزەرم بە سەر خەڵکیدا وەک میر

# ڕەقیب دڵخۆشە

لەپێخەی مەرگەوە دیسان دەسێ‌تر
لە ئێمەی بێکەسی سەندۆ، کەسێ‌تر
گوڵی مانگی گوڵانی هەڵوەراندین
لە قۆڵی مەی هەژاری نا، بەسێ‌تر

✧ ✧ ✧

خەمێ تازە، گڕی بەردا، لە جەرگم
بە لا ئالایە بالام، بوو بە بەرگم
محانجێنە[1] لە بەینی چوون و بوونم
زیاتر چاوەڕێی زاڵ بوونی مەرگم

✧ ✧ ✧

گوڵم چوو بوڵبوڵم چوو سومبوڵم چوو
پڕیشک و ئاوە پڕژێنی دڵم چوو
لە وەرزی ژینی پڕ ژانی ژیانا
نەتیجە و بەرهەمی وەلحاسڵم چوو

✧ ✧ ✧

لە هێلانەی شعورا تەیری ئەشعار
نەما توانای فڕینی روو بە گوڵزار
پەلوپۆی هەڵوەری، باڵی پڕوزا
شکا ئەوکی جریوەو نووکی هاوار

✧ ✧ ✧

---

١ – محانجێنە: شەڕ ـ جۆرە کایەییکی منداڵانە، کە بە پووڵ و دوگمە دەیکەن. بە دوگمە لە دوگمە ئەدەن ئەگەر هەڵگەڕایەوە ئەوە بردوویەتەوە.

کە ماڵی کامڵی وەک «نقشبندی»
مەگەر دوێنێنەبوو مردن بە ڕەندی
لە گۆڕی نا، لە ئێمەی خستە بن گۆم
چ گۆمێ؟ گۆمە گێژەی مان و مەندی

✧ ✧ ✧

خەمی کۆسپی «خەمین» هێشتا کولوورە
کرێوەو ڕێگەبەندانی سروورە
فرەی فرمێسکی ئاڵی روو بە خوێنە
گرەی سووتانی دڵ، گرپەی تەنوورە

✧ ✧ ✧

کەچی چەرخی کەچی ڕێگر چپاندی
بە گوێما، هەستە کۆنە خەم نەمان!!دی
هەواری دڵ هەراوکە، بۆ خەمێ تر
دڵت دابوو بە کێ؟ گەردوون شکاندی

✧ ✧ ✧

بە تیشکی روومەتو هەنیەی کتێوان
ئەوەی دووچاوی خۆی، لێوان و شێوان
لە سەر شانی تەزیوی چەن فەقێیێک
برا، داحسی گرانم، روو بە قەبران

✧ ✧ ✧

بەیانی، بەر بەیانانی بەیانم
وشەی هیوای قەوارەی عیلمەکانم
هەواری خاڵییە، ماتە بە کیشی
شەهی خاوەن شکۆی موڵکی مەعانم

✧ ✧ ✧

زمـــانی مـــەنتقی لاڵــە زەمـــانە

لە جەرگی فەلسەفەی زامی سەنانە

کـــوڵوکۆی شـیوەنێکی دانـەمرکا

بە شـینێ تـازەوە، دەردی گـرانـە

✧ ✧ ✧

لە تـاوی ئـەم هـەواڵـە کـەوتە نـاڵین

ستوونی پشتی فێر خوازانی رێی دین

بە پای نەحوا، چەقی دڕکی تون و تیژ

سەرف رەنگی بزڕکا، کەوتە لەرزیـن

✧ ✧ ✧

لە مـاڵە کـوردەوە نـاڵە و گـرینە

بەرینە، چونکی ئەم تـازە بـرینە

دڕی‌دا باوەڕی مەرگی «علائی»

بە کۆڕی شادمانی!! رۆیە، شـینە

✧ ✧ ✧

بــــەهاری (خـــوردەلووکی) نـــامورادە

ســــــەقز بـــازاڕی تـــەدریسی کـــەسادە

کە تەقریری نەما وەختێ مـەلای کـورد

رەقیب دڵخۆشە، چون شەشدەر گوشادە

✧ ✧ ✧

دڵی دوو گـوێ ئـەتاسێنێ خـوڕەی ئـاو

وەکوو کانی، ئەکەنیێ، خوڕ لە دوو چاو

لەگـــەڵ بـەفری کـفن بـاری بـە سـەریا

چ شیناوەردی ژیـن بـووا! لێـم بـووە داو

✧✧✧

ئــــەڵێی بـــێژنگم و غــەم دائــەبێژم

بــە دەم بــێژانــدنۆ دەم دەم دەبــێژم[1]

ئەرێ (هۆزان)ەکەی[2] نێو کوردەواری

منیش بۆ تۆ وەکـوو ئـەم خـەڵکە گـێژم

✧✧✧

بە ئـەو پـەیمانە مـەستم، داتـە دەسـتم

دەمێنم هـەر بـە ئـەو پـەیمانە، بـەستم

لە گوێسوانەی دەروونۆ دێمە سـەیرت

ئەگەرچی تۆ لە ژووریو من لە پەستم

✧✧✧

ئەتۆ رەمـزی حـەدیسی ئـەحمەدی بـووی

بە ناشوکرینەبێ حەیف و چ زووچووی؟!

وتـاری گــەرمی تــۆ گـیانی ئـەوین بـوو

مەگەر بەختی گەلی کوردی؟ لە روو چووی

✧✧✧

پـــــلاری مــــردنە، شــەرمی نــەبوو لێت

بە لەز[3] چون رێگران وا هاتە سەررێت

دڕی پـــــەردەی حــەیا بــردی حـــەیاتت

بە ئەوچی، خۆین لە ئاسۆی دڵ ئەچۆڕێت

✧✧✧

---

١- دەبێژم: ئەڵێم.

٢- هۆزان: زۆرزان، عالم

٣- لەز: پەلە.

دەمێکە داخ و دووخـانم خـەمێکە
له ئێوەی گەورە ڕێز گردن دەمـێکە
مەلای ئێمە هەتا نـەمرن، نـە یـارن
کە مردن مەرگی هەر یەک عالەمێکە

✧ ✧ ✧

گر و گاڵم گرووی دەردی دەروونـە
ئـەگـینا هـەر ژیـانێ بـۆ نـەبوونە
ئەمن (کۆلیل)ی تۆ نیم هەر بە تەنیا
دڵـم بـۆ هـاوەڵانیشت زەبـوونە

✧ ✧ ✧

خـــەیاڵی مـــن مـــناڵە کـاڵە بـیری
لە ئـــێوە بـا بـپرسم کـۆڕی ژیـری
کە جێگەی ئەم خەسارە، چۆن پڕۆکەین
بـە هـەوڵ و لێبڕان؟ یـا گـۆشەگـیری؟

✧ ✧ ✧

دڵـم هـەرچـەن بـرینە و پـڕ لە نـاسۆر
بە بەحری ئەبجەدی سەرهاتە سەر شۆر
لە مـێژوی فـەوتی مـامۆستا بـخوێنە
«خواوەننا (عـطا)کـە پـێ‌ئەشێ زۆر»[1]

**سەقز مانگی گوڵانی ساڵی ١٣٦٥**

---

١ - ئەم قەسیدەم لە مەرسیەی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا شێخ حوسەین خانی عەلائی‌دا داناوە ـ نیوەی شیعری ئاخر بە پێی حەساوی ئەبجەد، وە بە ڕێنووسی کوردی جویّ لە وشەی (عطا) کە بەو ڕێنووسە نیە، دەکاتە ساڵی لە دونیا دەرچوونی، واتە ساڵی ١٣٦٥ای هەتاوی.

# کورته دەستم

(عومەر) تاسەت وەها تـاساندی هـەستم
دەس و دیدەی وتـە و هـەڵبەستی بـەستم

ئـەگـەرچـی لێم ونـی بـەینێکە ئـەمما
دەڵـێم شـیعرێک بـەیادت هـەڵ ببەستم

دەسی دۆسـیم درێـژ کـرد بـۆت لە مـێژە
خەجاڵەت خۆم کە ئـێستا کـورتە دەسـتم

دەنا چۆن مـن دەبـێ هـەر هـەفتە جـارێ
نەکـا شـیعر و قسـەت وەک بـادە مـەستم

قەسەم بەو رۆژە یا بەو بەردەکەی خۆت[1]
لە جـامی دۆسـتیا مـەستی ئـەلەستم

ئـەوا دووجـارە دێـم بـۆ شـاری سـەقز
بە یـەزدان تـۆی دنـە و ئـامانج و قـەستم

غـولامی تـۆیە (ئـاسۆ) شـەرتە ئـەمجار
بـەرەو لات بـێم لە هـیچ لایـێ نـەوەستم

**ئەم پارچە هەڵبەستەی ژوورەوە لە لایەن کاک سەعیدی (ئاسۆ)وە لە رۆژی چوارەمی مانگی پووشپەڕی ١٣٦٥ی هەتاوی، بە دەستم گەیشت، منیش لە وەڵامی نامەکەی (ئاسۆ)ی بەرێزدا، ئەم پارچە هەڵبەستەی خوارەوەم بۆ نووسی.**

---

١- ئێشارەیە بە پارچە هەڵبەستێک کە بۆ دۆستێ بەو ناو نیشانە وتومە.

# خەجاڵەت بێ هەژاری

لە ئاسۆی دڵمەوە (ئاسۆ) دیاری
لە ساڵی ژینما، وەرزی بەهاری

بە لەش بێبەش لە گوڵزاری حوزورم
بە دڵ لای گوڵ هەڵمداوە هەواری

هەڤاڵێکی وەکوو تۆ بۆ منیزار
هەواڵێکی خەلاتێکە بە باری[1]

چەنێ تۆ تاسە خواری من زیاتر
لە ئەندامی دڵمدا شادەماری

وەلامی نامەکەت بۆیە دوا کەوت
لە تاوانا نەبوو کەس، بێ بە یاری

بەڵێ بۆ ئێوە نووکی خامە رامە
لە دەستی ئێمەدا زیزە و فەراری

شەماڵیش نەیتوانی بۆت بهێنێ
پەیامم، نەک بسووتێ وەک پرواری

---

١- باری: بەزدان

مـژۆڵ و ئـەشكی سـوورم گـەر نـەبووبان
دەمـــامۆ تـــا نـــەمانی شـــەرمە ســـاری

كە فەرمووتە، (خەجاڵەت خۆم) مەفەرموو
ئـــەويش بـــا زل نـــەبێ فـــيز و دەمـاری

لەمـــــێژە دەســــــتی دۆســــيتان درێـــژە
خەجاڵەت دەست و پێی كورتی هـەژاری

مـــن و تـۆ هـەر دوو گـركەی بـڕكەيێكين
بــڕا بــڕ بــوون، بـە بـاڵای كـوردەواری

دەست كـورتە هـەتا كـوردی وەكـوو مـن
لە هــەر مــەزرايــێكا شــين بـێ، بـژاری

هــەنار و بــێ بــی، هــەرببباری تـوونی
ترێ بـی تـووری، كـاڵەك بـی، خـەياری

هەزار چاكەت هەبێ، هەر يـەك حـەسێوە
خــــراپــێكت دەبــێتە ســەد هــەزاری

لە بــۆكـــان تـا سـەقز شـانێكە[1] ئـەمما
لە ئــــێمە بــۆتە چــۆمی بــێ بــواری

ئــــەرێ! دەســــتی نــەيارە وا لە نــێوا
كــە مــن دايــم پــيادەو تــۆ ســواری!

---

١- شان: ملە

گـــرينێ بـــرين رابـــچڵەكـــێنێ
ناخێكی بە داخ ســای لێ هـەڵبێنێ

ئـــاوا گـــرينێ لە هـــەر شـــوێنێكا
بـەردە سـماتەیش هـەڵ ئـەپەڕێنێ

كەوابوو بگری ئەی دڵە، هـەروەک
ئەو پیاوە گەورە، وا بە تەنیا و تـەک

ئەی وت بە خەڵكی دێكە، راپـەڕن
زاڵم لە مستیش دەترسێ وەک چەک

**سەقز رەشەمەی ١٣٦٣ای هەتاوی**

# ئەی دڵە بگری

ئەی دڵـە بگری بـا لە چـاوی شـەو
گرشەی فرمێسکت هەڵـفڕێنێ خەو

تـیشکێ بـاوێژە لە گـیانی خــەڵکێ
سەریان وا لە ژێر بەفرا، وێنەی کەو

خەڵکی دێـیێکی چـۆڵ و وێـرانــە
دیــلی دێـوی زۆر، بـڕۆ و بـێرانــە

قەتیس ماو لە نـاو سـینگی لاوانــی
نارەتەی بەرزی، مەردی و شـێرانــە

پشتی چەوساوەی خەڵکی ئەو دێیە
بۆ دەخڵ و خەرجی خانێ، شاڕێیە

هەر پشتە کۆمێ تـۆ بـڕوانـی بـۆی
شوێنی شـەللاق و تـازیانەی لێـیـە

بگری هەتاکوو بە ئـەسرینی گـەش
لاچێ تـاریکی شـەواری رووڕەش

لەم گــــۆڕستانە کــە نــاوی دێــیە
ببی بـە عـیساو گـیان بـخەیتە لەش

نـــــزيكی مـــه، بـــه فـــێڵی فـــيتنه دووره
رەقــــــــيب لاوی بــــــەڵێنی داله داری

نـــەزانـیّ بـەڵكوو ئـەو، هـاتوو كـه هـاتی
ئـه‌گـينا مـەرجـەكـەت دەشكـێ قـەراری

به ئەو شەرته بـه دڵ كـردووته، (كـۆليل)
ئـــــەكــا دەرمـــانی، زامـــی كــۆڵەواری

سەقز پووشپەڕی ١٣٦٥ی هەتاوی

# هەرێمی مردوان

ئەم شارە دێیە، هەر وەک هەرێمی[1] مردوانە
بـــایەقوشیش لە بـــۆنی وێـرانـەی بـێ زوانـە

نەسرتەیێ نە دەنگێ نە زیـڕە زیـڕی زەنگـێ
نـــە شـــینە، نـە شـنینە، نـە مـانە، نـە شکـانە

تەنووری سینە بـێ گـڕ هـاواری دەردە داران
لە نـــێو دەمـــا قـــەتیسە، وسکـوتە، لێـوبڕانـە

مشتی کەپۆڵ شکێنی قـەوی کـە عـاسمانیش
لە زەبـری دادەخـورپێ دڵـی، دەردی گـرانـە

مەگەر کاسەی سواڵـن دەم پـان و داچـەقیون
لە پـــۆڵی مشـتە کـۆڵی، ئـەم گشـتە پـاڵەوانـە

تـــەنیا هـــێژامـرۆڤی دەنـرکێنێ وەکـوو شـێر
زمـــانی تـــێغی تـیژە، بـیر و بـڕوای هـەسانە

پەشێوە کەف بەلێـوە، وەستاوە چـەشنی کـێوە
بۆ راپەڕین بەڵێوێژ، بۆ ژێر دەسی و بـەلاّنـە

سەقز رەشەمەی ١٣٦٣ی هەتاوی

---

١ - هەرێم: مەڵبەند

# مردن لە رێی ئەوینا

بڕژێ، بابڕژێ خوێنم
با هەر بمێنێ شوێنم

مردن لە رێی ئەوینا
لە رێی گەلی بێتینا

مانای وشەی ژیانە
واتەی هەمیشە مانە

مەرگم هەوڵێ عەیانە
بەرەو ئاسۆی بەیانە

خوێنم ئاوەنگی نوورە
بۆ ئەم عەرزو سنوورە

خوێنم لەمپەری[1] زڵمە
کوژیان بۆ گەل بە دڵمە

چونکە ئەم جۆرە چوونە
بۆ هەر گزایگزبوونە

خوێنی گەرم و رووسوورم
تەرم و لەشی خاپوورم

پێشکەش بە بەژنی خاکم
بە سەر زەوینی پاکم

خوێنێ وابێ رژیانی
سەدجار منەت بە گیانی

چونکە ئەڕوێ بە ناوی
گەنمی سوورو خوێناوی

یاران هەڵسن دەی هەڵسن
خوێنڕێژ لە هەڵسان قەڵسن

هەر وەک هەڵۆی بەرزە فڕ
سینگی زاڵم بکەن شڕ

لە سەر مافی کشت و کێڵ
رۆژی روونی بکەن لێڵ[3]

---

١- لەمپەر: بەرگر.

٣- ئەم پارچە هەڵبەستەو هەروەها دوو پارچەکەی پێشەوەیلە ژێر سەردێرەکانی «ئەی دڵە بگری» و «هەرێمی مردوان» بۆ تیپی شانۆی ئازادی سەقز، بەشی کوردی، نووسی، تا لە شانۆی «گەنمی خوێناوی»داکەڵکی لێ وەرگیرێ».

# بۆسروه

کاتێ لە سەر تەرمی دڵم
لە چاو ئەهات ئەشکی کوڵم
نینۆکی تیژی پەژارە،
بۆ دڵم، ئەی ڕنی کوڵم
کاتێ کە خەم بە نقورچک،
کوتی دەکرد، جەرگ و گورچک
کاتێ شادیم لا مردبوو،
وەک دڵ، خوا عافووی کرد بوو
سەرمای هەناسە سەردەکەم،
ڕێی بە ڕێبەندان گردبوو
کاتێ لە نێو بەحری ئەشکا،
پاپۆڕی هەنسکم، ئەشکا
دووکەڵی کوورەی دەروونم،
ئەیتوانی زوڵفی شەو ڕەشکا
کاتێ لە ئاسۆی لێو بزە،
زاتی نەبوو بێتە وزە
لە نێو ئاشی زەمانەدا،
گیانم ئەدا لە جێی مزە[1]

---

١- ئەو گەنم و جۆیە کە ئاشەوان لە تۆڵەی هاڕیندا لە ئاش هاڕ وەری ئەگرێ.

سروه ماڵی ئاوەدان بێ،

تەمەنی ژوور، لە سەدان بێ

سەر لە نوێ، بووژانمیەوە

ژانی دڵی رەشی ژان بێ

سروە سورمەی چاوی کردم،

خەمو پەژارەی لابردم

بە زمانی باوک و باپیرم،

وشەی هیوای بۆ هاوردم

سروەم بوو بە عیسای زەمان،

«قُم باذن الله»ی کوت بە گیان

جێ لەو تەو ژ مە خستیە لەش،

کابەی عیشقی پێمدا نیشان

سروە هەوری خەمی رەوان،

رەشە بای هەناسەی خەوان

چۆکیدا سەر دڵی دێوێ،

ببوە خێوم رۆژ و شەوان

پەیامی «کۆلیل»ی کە سەر،

بۆ سروە پەیکی خۆش خەبەر

بە هێمنی، بە ئەسپایی

ئاوا لە ئەوکم دێتە دەر

کە زۆر رۆشن مەبە، نەکا

تاریکێ رێت پێ هەڵەکا

ئـەڵێن دز کـە چـوو بە دزی
فـوو لە شـەمی ڕۆشـن ئەکـا
لە دوایـیـدا سـروە پـرسێ
نـەپرسم، خـوێنم دەگـرسێ
چی بـوو خـێرا بـەرگت گـۆڕی
لەم گـۆڕانـەت، دڵ دەتـرسێ
چـەن مـانگێکت تـێپەڕیوە
دووڕا بـەژنی تـۆیان دیـوە
کـەچی لە مـەودایـی کـەما
ڕەنگ و ڕووی پـەڕەت پـەڕیوە

**سەقز سەرماوەزی ١٣٦٤ی هەتاوی**

# یا خواگەورە بیت

کۆرپەی شیرەخۆر نووری چاوەکەم
نەسیمی خۆشبۆی ماڵ و ماوەکەم

شەمی پەپوولەی ژین و ژیانم
نەشئەی شکۆفەی سروەی بەیانم

رۆڵە، (رەفیق)م هیوای داهاتووم
بەرهەمور نەختی عومری رابوردووم

قاڵبی خشتی هەست و مەبەستم
بڕبڕەی پشتم هێزی دوو دەستم

هاتووکە مردم لە تۆ جیا بووم
هەر وەکوو یاران تەفر و توونا بووم

دەخیلە رۆڵە خیرەت بنوێنە
شەنگی خۆت لە ناو قوڕاو دەربێنە

بە هیوام لاوێ ژیر و وریا بی
بۆ گەل و هۆزت چوست و ئازابی

فــريو دەر نــەبی بــۆ پــارە و دینار
خزمەت گـوزار بـی بـە پـۆلی هـەژار

قــازانــجی کــومەڵ نـەنیتە ژێـر پـێ
با هەر وەک چاکـان دەنگت دلێـر بـێ

هــەر وەکــوو رێــوی فــێڵەباز مـەبە
بــۆ دەسـتەی نـەزان نـەوا سـاز مـەبە

رەفــێقی مــەکــە لەگــەڵ نــامەردا
گــەوهەری قــەدرت مـەدە بـە بـەردا

لە مـووچەی رژدی و کـینە و بـەخێلی
درۆ و دووڕوویــی، هــێلی نــەکێلی

نـاموسی مـەردم لە لات پـەس نـەبێ
هۆشت سپوردەی دەس هەوەس نـەبێ

نان و نمەکـی کـەس حـەرام نـەکـەی
رۆڵە، رووسـوورم، رووسـیام نـەکـەی

حــورمەتی نــاموس بــناغەی دیـنە
پیاوی بـە نـاموس قـاموسی ژیـنە

رۆڵــە بــخوێنە، جــوانــی فــرسەتە
جــەهل و نـەزانـین پـایەی نـەگـبەتە

هــــەتا جــــوانــــی ســـەرمایە داری
هــەوری بــارانـی مـەزرای بـەهاری

بــه گـەنجی لە دوای زانـین نـەگـەڕی
لە کـــاتی پــیری گــەڕو بـێفەڕی

پـیاوی خــوێنەوار لە وەرزی پـیری
چــوارده ســاڵانه مـێشک و زەمـیری

تــــەقالا، چـــرای رۆژی نــــەهاتە
هـەتاوی بــەرزی هــاتی و نـــەجاتە

لێت مەعلووم دەبـێ بـاوکت رەئـووفە
کوردێ خوێن گەرمە، نە خەڵکی کووفە

لە بـــیرت نــــەچێ رۆڵـــە ئــامانە
هـــیوا دەرمـــانی، دەردو زامـــانە

لای لایـــــە رۆڵــە، لای لایــە رۆڵــە
یــاخوا گـەورە بـیت رۆڵـەی شـلکۆڵە

ئەو پارچە هەڵبەستەی ژوورەوەم بە ناوی دیاری و پێیلە دانا بۆ (رەفێق)ی کوڕی (مەلا رەئووف)
یەکێ لە هاوەڵاتی‌کاتی گەنجیم، هیوادارم رەفێق و رەفێقەکانی کەڵکی لێ‌وەر بگرن.

سەقز خەرمانانی ١٣٥٥ی هەتاوی

ئەم پارچە هەڵبەستەی خوارەوەم،لە وەڵامی نامەیەکدا نووسیوە، کە کاکە ئەنوەری موحەممەدی بۆی نووسی بووم. ئەڵبەت ناوبردنی هەندێ لە شاعیران و نووسەران بەو بۆنەوە بوو، ئەنوەری بەڕێز ناویانی لە نامەکەی خۆیدا هێنابوو، وەکوتبووی ئەمانە هەتا هەتایە، وان لە سەر زاراو، لە بیری خەڵکی ناچنەوە.

## کفنی نەسیم

ئەنوەر هەم دیسان، پاخەسووی بەهار
دای لە گۆنای گوڵ تیف تیفەی ویقار
شەونم گەیشتە ئەژنۆی خۆری شەنگ
شەماڵ زریانی دایە بەر هاوار
خوێن زاجێ بازنەی مەچەکی دڵبەر
عارەق لە هەنیەی شەوبۆ هاتە خوار
لە سەر تەوێڵی پۆلی گولاڵان
جێگە دیانی تاج لە دوور دای دیار
چەخماخەی تیژی شمشێری هەوران
خێڵخانەی هەرەس ئەکا لەت و پار
هەڵخزا پای مێش لە سەر سینگی ساف
مەل چەپڵەی لێدا بە باڵ و مینقار
ئاو کەوتە ڕێگا بە دەم ڕۆیینو
لە خۆشی خۆیا ئەکەوێ جار جار
مزگێنی بەهار بڵاو ئەکاتۆ
تەڕ ئەکا فەرشی سەوزی مێرغوزار
بای سەباخشیا وەسەر بەیانا
پەنگی خواردەوە شەوەق لە ناو شار

له شەوقا (کۆلیل) چاوی لەیلی ڕەشت
بە مێلی خامە و بە کلی ئەشعار
مەنسوور کەوتە ناو دەریای ئوکسیژن
بووژی تێهاتۆ تا چوو بە سەردار
کێ کفنی بەهار کریا وەبەریا
مەرگی نابینێ چاوی ڕۆژگار
جامی لە یومنی ئایەی بەهاری
ڕژایە دەریا، بە چەشنی ڕووبار
بووعەلی سینا بە یاسای سرشت
شیرەی گژ و گیای هێنایە وتار
خانی چەپکێ گوڵ لە باغی ڕەبیع
دا لە بەرپێخەی زینی چاو خومار
خانا نەیتوانی وەسفی شیرین کات
بێ خەت و خاڵی کوڵمی لالەزار
نامی لە جامی جەمی تا ڕوانی
کەوتە سەر هەوای بەهار و گوڵزار
مەولەوی، نالی، گۆران و مەحوی
ناری و هێمن و بێکەس و هەژار
بۆیە وجاخی هەموویان ڕوونە
دۆعای بەهاریان بۆ کەوتۆتە کار
بەڵام هەر کەسێ وەک تۆ ئەنوەر بێ
(کوڵیل)ە بە هۆی تاریکی شەوار

# فێڵی خێڵی پۆشتە و پەرداخ

تاقە خوایە رایەڵ و پۆی، تەونی شیعری رشتە ئەنگوشت
منیش بێ پیشەکی ئەڵێم: خەزانی خەم بەهاری کوشت.

لەجێی ئەوەی پا هەڵخزێ، پا لەژێر باوەڕا دەرچوو
بە گیانی عیشقی دڵ قەسەم، کوێرە رێگا رێبواری کوشت

من چیم داوە لە بێ ئەنواو کراسی سەوزی مێرگی بەهار
باری لێوی بووکی برین، بیری بەرگی هەژاری کوشت

قات و قڕی بێباوەڕی، بوو بە خێو و کەوتە وڵات
دەستە دەستە، قەتار قەتار، هەزار هەزار، بڕیاری کوشت

ناڵدار هات و ناڵی رزان، خاڵدار هات و خاڵی نوان
ماڵدار هات و بە زێڕ و ماڵ، کۆتر و کەوی باڵداری کوشت

ئەشکی هەتیو بوو بە شەتاو، شەتاو هات و رژایە چۆم
سوێری جەرگی ئاوی بڕی، فرمێسکی روون رووباریکوشت

قین و قاری چاوی خومار، ئەوینی بە فیز و دەمار
ئاسمانی ساوی داپۆشی، کاڵای گران کڕیاری کوشت

تاریکە شەو، دەستی نایە بینە قاقای کچی هەتاو
فێڵی خێڵی پۆشتەو پەرداخ، بە تاشای دڵ شڕباری کوشت

وسکوتی هەوری بێباران، ئەونەی قیژاندە مل گوڵا
وەرزی گوڵان رەشی پۆشاو، سەرما هەزاری زاری کوشت

باوێشکی داگوڵی خەفەت، حیجابەکەی دڕی تەواو
بە نامەحرەم کە خۆی نواند، بولبولی بێقەراری کوشت

غەریب و شارەزا نەما، لەرز هەڵی نەچۆقێنێ
تەنانە تۆفی سەرد و سڕ (کۆلیل)ی کۆڵەواری کوشت

ئەم هەڵبەستەم لە وەڵامی ئەو چەند شیعرەی خوارەوەکە
حەمەغەریب ناوێلە شاری سنەوە بۆی ناردبووم نووسیوە.

سەقز ٧٥/١١/١٦ی هەتاوی

## ئەمەش دەقی شیعرەکانی حەمە غەریب

ئەڵێن کاتێ کە بەهار دێ

هەموو خەڵکی شار و لادێ

دەڵێن ئیتر شادی دادێ

بەرگی هەژار دێتە مەیدان

بە بەهایەکی زۆر هەرزان

پۆشاکی گەل، دەبێتە ئاسمانی هەساو

هەموو باڵدار و تەیر و مەل، رزگار دەبن لە کۆت و داو

ئایا ئێستا تاریکە شەو

گشت جیهانی، داپۆشیوە؟

ئەگینا من نابینا نیم،

بەهاری وام قەت نەدیوە، قەت نەدیوە..

حەمە غەریب ١٤/ ٧٥/١١ی هەتاوی

# ساڵی تازه

سالّی تـازه جـه‌شنه دڵـبه‌ر، ئـاوی چـه‌شمه جـاری‌یه
ئـــه‌رزی بـــه‌رپان و بـــلاّوی ئـــێمه ره‌نگـی نـاری‌یه
وان له سه‌حرای عه‌یش و شادی تیپی لاوانـی وه‌تـه‌ن
مـــه‌حشه‌رێ بـــه‌رپا کـراوه، زه‌مـزه‌مه‌ی مـه‌یخاری‌یه
به‌زم و ره‌زمه و زیـل و بـه‌م، ئـه‌مما بـه بـێ‌تۆ مـاته‌مه
چـــونکه شـادی بـێ‌وجودت چـاوه‌کـه‌م نـاچاری‌یه
چون که‌مه‌ندی رۆسته‌می زابول دو زوڵفت هـه‌ڵقه‌کـه
بیخه‌ره ئـه‌ستۆی دڵـم، ئـه‌و شـێته کـوشتن چـاری‌یه
(رۆژی ئه‌ووه‌ڵ بـو کـه‌زانـیم) قـاتڵی شـاعیر ئـه‌تۆی
حـوسنی تـۆ قـاتڵ، وه‌لێ ئـه‌م ره‌مـزه‌کـاری بـاری‌یه
ســـاڵه‌ها ســـاڵه له داخـــی لێـوی عـه‌مبه‌ر بـۆنی تـۆ
(حه‌وزی که‌وسه‌ر) لێڵ و وێڵه، جـاری‌یه، اجـباری‌یه
عـــاله‌مێ گشـــتی ده‌زانـــێ مـــن کـــه عـــیشقم غـاڵبه
چون نیشانه‌ی عیشقی به‌رهه‌ق گـیانه‌کـه‌م بـیماری‌یه
ئاهی دڵ سۆزی، (عومه‌ر)، ئاخر به حه‌تمی دێته رێت
رۆژی مه‌حشه‌ر پـێت ده‌نـاسن، کـێیه کـاری لاری‌یـه

بانه ـ ١٣٤٧ای هه‌تاوی

دووهه‌مین شیعری غه‌زه‌ڵ، له سه‌رده‌می فه‌قێیه‌تیما.

له سالی ۱۳۵۶ نامەیەکم بۆ یەک نەفەر نارد کە بیس تەمەنی لەلام بوو، لە نامەکەدا چەن شیعرێکیشم بۆ نووسی بوو. ئەویش عەینی نامەکەی بۆ ناردبوومەوە. کوتبووی خۆشم لە شیعر نایە، منیش ئەم شیعرانەم بۆ نوسی

## هاتم خاسی کەم

کەسنەزانی هۆ بە تو۱۳۵۶/۱۱/۱۲ی هەتاوی

مِـــنّی الی مَـــنْ کـــان رفـــیقا
لکـــــنّهُ الان ضـــــلّ الطّـــریقا

ارجـــو مِـــن الله تـــوفیق الاحـــباب
لِکـــلًّ خـــیر و جُـــلًّ الصـــواب

و بَـــعْدَ هـــذا فـــاسْمَعْ مـــا اقـــول
سَـــمٰاعَ اَلسَّـــمِح بـــاذْن القـــبول

عَـــلیٰ مـــا قـــال عَـــنک الغـــریبُ
شـــیئاً عـــجیباً اِذَنْ اُجـــیب

ئـەمڕا بـە شـێوەی سـاکـار و ڕەوان
بۆتی ڕێ ئەخەم شیعرێ چەوت و پـان

نـالێم بـە غـەریب چـیتان وتـووە
لە چـوە نـاچم چـی چـووە چـووە.

وەلێ تـۆ دۆسـی گـیانی گـیانی بـووی
کـەی وێـنەی نـەیار یـا فـلانی بـووی

بـۆ تـۆ مـن بـاسی گـراوێکم کـرد
هـاتم خـاسی کـەم خـراوێکم کـرد

دیــــاره لەگــەڵ تــۆ ڕێکــی لاریــیە
چــون دەردی مــێشکت تـەواو کـارییە

نــازی پــڕ نـووزەی ئێوەی نـۆ کـیسە
نـــــەمزانـــی ئــەونە ژاراوی‌و پــیسە

شـــیعرێکی ســپی لە نــەسلی بــڕیار
کــیژی گـوڵی یـاس، بـە عـێل و تـەبار

بــۆ دەســتەی ئێوەی نـامەحرەم نـاوێ
مــــەگــەر مــنێ گــێژ فــریوی داوێ

داخم ئەو شیعرە جـوانـەی بـۆتم نـارد
ناشیرینت کـرد بـە چـەن قسـەی سـارد

هــەقت پــێ‌ئەدەم، پـووڵت پـێدابـووم
خۆم کردم بـە خـۆم، ئـاوا رسـوا بـووم

دەردی بـــێ‌دەرمان رژایــــە لەشــــم
روو رەش لە حـەنای شـیعرێکی گـەشم

داتــــۆ بــە ســەرما شــیعرێکی پــەتی
چون (ماڵ قەڵو سەر بە خـاوەنیەتی)

هەرچەن پـوڵەکـەت دریـا بـە گـۆشتاو
بــــۆتم نــــاردەوە ســــامەیکەرەقاو

چـــی بێژم بە تـۆ بـۆ خـۆم «کـۆلیل»م
ئــەبێ هــەروابــێ هـەدیەو بـەر تـیلم

لای ئـێوه و مـانان، یـا هـەر نـاکـەسێ
بـایەخی هـەڵبەس بـاڵە مـەگـەسێ

شـاعیر کـوڵک و مـوو شـی ئـەکـاتەوە
ئـەوەی شـاعیرە خـوا بـیباتەوە

هـونەر قـیمەت و ئـەرزشی نـییە
سـەر بـاشقەی هـونەر خـۆ فـرۆشییە

شـیعر بـبوایـە ئـەگـەر رەواجـی
کـام شـاعیر ئـەمرد بـە هـۆی نـاتاجی

چون خاوەن شـیعرن رەجـاڵ و رووتـن
جا با هەر بۆ گـەل وەک شـەم بسـووتن

پـووڵی کـردایـە بـەیت و بـالۆرە
بـۆ رەق ئـەبوینۆ چـەشنی قـالۆرە

وەک بـێکەس پـەنا بـە شـیعر بـردن
نـاشیرین تـەکـا،تـاکـاتی مـردن

بـێشک هـەر شـیعر مـەولەوی مـران
سینگی خـەفە کـرد، بـە سـەنگی گـران

قـابیزی گـیانی (بـێسارانـی) بـوو
سـەدان شـاعیری هـەورامـانی بـوو

رفـاندی (نـالی) هـەتا هـەندەران
بـۆ شکـاندنی سـپای هـۆنەران

هـــيوا و گـــولاڵەی (گـــۆران)ی تـۆران
له (حاجی) و (زیوەر) بووبه باو بـۆران

جەرگی (ئەدەب)ی کردە کۆی زوخـــاڵ
بـــەربووە لاشـــەی ویـــنەی قـەل و داڵ

لێـــــی کـــردە دژمـــن ژن و خـــێزانـــی
بـــە کـــوێری چـاوی ئـەوینی جـوانـی

بـــــوو بـــە ئـــەوینی نـــازی پـــیاوێتر
دایکـــی خـــانان و خـــوا پـــێداوێتـــر

(قـــانع)ی گـــەیان بـــە ئـــاشەوانـــی
هـــەڵی کـــەن له بـــێخ ریشـــەی رەوانـــی

باریکه نووسەی تـووشی (هـێمن) کـرد
سەد وەک (پیره مێرد) به میسراعی مرد

(هـــەژار) هـــەژاری هـــۆنه و هـــەڵبەسته
تـــەفرەی بـــاوەڕو بـــیر و راو هـــەسته

بـــوو بـــە مـــێملی (سـالم) و (حـــەیران)
( مەستوره)ی شۆخی را و نا،له سەیران

مـــــنیش بـــــە قـــامکێ ئـــەمانە نـــابم
ئـەشێ بـۆ شـیعر و شـەرعی رسـوا بـم

کـــێ ســـاویلکه بـوو چـون تـۆ له کـارا
دایـــە نـــاو دەمـــی شـــیعر و ئـەشعارا

## بۆ خۆشی و شۆخی لەگەڵ کاکە فەتحوڵای نووریدا

بــڕ بــڕەی پشــتم تــرووسکەی چــاوم
ڕەمــزی بــرووسکەی تــاسەی ژاکــاوم
ئــاوی زەمــزەمی گــەرووی خــنکاوم
شــا بــەیتی شیعری ســەر لێ شێواوم
خــۆشەویستەکــەم فــەتحوڵای نــووری
دوورو بــەینێکە بــۆ ئــەکــەی دووری
نــەهات و چــوویێ نــە تــەلەیفوونێ
نــە ئــاوو گــۆشتێ نــە بــۆقلەموونێ
بــۆقلە ڕەشــەکــەی لای بــاوەهاتوو
هــەر نەتدا پێمان، تـا مـردارۆ بـوو
بــەو فـەرشەی قـەسەم وا نـەیاندا پێت
گــفت و لفــتەکــەت لە بیرۆ نـاچێت
بــەلام تــۆ تــەواو لە بــیرت بــردین
بــرا وانــابێ هـــارۆژێ مــــردین
یـا نـەکـا مـەلوول بـۆ کـارەکـەت بـی!
بــۆ پـارەکـەت و بـۆ شـارەکـەت بـی
خــەفەتی نــاوێ خــۆ بـەرە دەس خــوا
«خــوا هــەر خــوایە و دنـیا کـاو بـا»
مــنیش تـامەزرۆی یـەخچاڵم وەک تـۆ
سەوزی دوازدە فووت کارخانەی فـیلکۆ
ئــەوا بــەینێکە بــێ کــار و ئــیشم
وەکــوو جــەنابت مـنیش فــنیشم

نـه سـاحێو چـەکـم، نـه خـاوەن فـیشم
دوچـــار چـــزەی مــار بــەد نــیشم
گـسیره لەشــەشدەر، مـۆرەی نــەجاتم
تــۆ کــیشی بــەلاّم من کـیش و مـاتم
له بــــێخا دنــــیا وا بـــنیا نـــریا
له یــەکــێ ســنیا بــه یــەکــێ دریــا
یـەکێ قـەولّیدا یـەکێ قـەولّی سـەند
یەکێ هـەولّیدا و یـەکـێ کـەولّی کـەند
یــەکـێ خـوێنیدا و یـەکـێ جـوێنیدا
یەکێ سوێنی خـوارد یـەکـێ سـوێنیدا
له بــیرت نــایه خــلەی مــام بــله
وتــێ بــه خــولەی حـاجی چــلچله
تـــــرێ بـــڕێکی دەبـــێته قـــله
هــا خــلەگــه مــەو، هــا گــله، گـله
هەر سـفت و سـۆلّێ جـار جـارێ شـله
گـا(نـوەین)، گـاگـا (مـله) وه مـله
مـێش بـه سـەر گـۆنای لەیلۆ خـالێکه
خـاڵ له ســەر لێـوی کــنجا داڵــێکه
فــەته گــیان ئــیتر شـیعرم تـەواو بـوو
بـۆ بـۆقلەکـەتان جـەرگم کـەواو بـوو

کـــەما و بـــێڵەهەڕ خـــۆراکـــی کـــەرە
کـــەرکـــەی تـــاڵبی شـــیعر و هـــونەرە

(عـومەر) بـا بـەس بـێ ئـەم فـڵتە فـڵتە
ئـــــەسڵ پـــــارەیە،هـــــۆنراوە تـــــڵتە

# وەسای تەقەڵ دۆز

یــاگــەی ئــاواتــی دڵـە تـەنگەکـەم
هێـزی دوو ئەژنۆی کورت و لەنگەکەم

سورمەی دوو چاوی تار و تەمەکـەم
تــەسکینی دڵــەی پــڕ لە خــەمەکـەم

باغچەی پڕ لە گوڵ فـەسڵی سـەیرانـم
ڕەفـــێقی ڕاوگـــەی پـــۆلی جـــەیرانـم

وەسای تەقەڵدۆز کـەوای خـاڵخاسان
نـــەقاشی یــێخەی پـــەنجە ئـەڵماسان

خاڵۆی ئیخراجەی کوڵۆنجەی کـیژۆڵە
عـاشق بـە زرنگـە و خـرنگە مـەنگۆڵە

قـــەڵپەی قـــەڵوەزەی سینە زامـەکـەم
کاک وە سافەرەج فـەجری شـامەکـەم

یــە بـەینێ وەخــتەن بـێ دیـداری تـۆ
لە جــەرگەی جـەرگم شـیوەنە و ڕۆرۆ

بــالام بــێ ئـالات، تـەواو خـەمیاگـە
وەک چەمەر خەیار، لوول و چەمیاگـە

دەروونــم یـانەی خـەفەت و جـەورە
جـەختم بـۆنایێ، بـەختەکـەم سـەورە

حـاڵم پـەرێشان وێـنەی زوڵـف لەیـل
دەروون پڕ لە دەرد ئـاوارەی دوجـەیل

تــۆزی بــێ تــۆیی نـیشتە لە رەنگـم
خەفەت گـڕ کـەردەن زایـەڵەی دەنگـم

وێـــنەی بـــایەقوش رەفـــێقم چـــۆڵە
پــــاڵتاوی شــۆمی ... لەرزم لەکــۆڵە

ژیـــان و ژیـــنم ژانـــە و ژقـــنەمووت
بۆم قووت نـادرێ قـووت لایەمووت

ئازیز وەمـەرگت، مـەرگم پـێ خـۆشە
چون دیگ زووخاو پڕ کوڵ و جـۆشە

تــەواو خــاپوورە یــانەی دەروونــم
بــەینێکە یــەکــجار زار و زەبــوونم

نــە رۆژ و نــە شــەو ئــارامــم نـییە
خــۆیشم نــازانــم ئـەم دەردە چـییە

ئەلبەت دوور لە رووت رۆی نـەهاتیمە
کـــــۆتایی شـــادی ســـەر بســـاتیمە

یا خۆ بێ مەیلی و کەم شـەرتی یـاران
یانەی سەبرەکەم کردەن سـەنگ بـاران

یــا هــەر زەمــانە زەمــانەی خــەمە
بــۆیە بــەم جــۆرە دەروونــم تــەمە

بە هەر ئەحواڵێ من جـەستە خـەستەم
دەروون پڕ لە زام وەک ماران گـەستەم

ئــیسە گــیانەکــەم قــاسد هــەناردم
نــامەی زەلیــلیم وەنــەش سـپاردم

شــایەد تــۆ وێــنەی لوقــمان حـاڵی
یا نەکەی سینەم لە خـەم کـەی خـاڵی

هەرچەن زەحمەتە و سـەردی زۆسـانە
ئــازووقەی دەوڵــەت روولە نــەمانە

زەحــــمەت بکــێشە رەفــێقی ژیــنم
وەبــزا مـن مـردووم بـێ بـیکە شـینم

یــــا بــــرازاوای بــوکی خــەمم وە
ســاتێ مـیوانــی سـفرەی کـەمم وە

بـەڵکوو لە سـایەی هـیممەتی بـەرزت
ژیــان تــازەکــەم بــبمە هـاومەرزت

ســووری بـێتە سـەر گـۆنا زەردەکـەم
ساتێ سـاکـن وێ ئـێش و دەردەکـەم

نــەک خـوانەخواسە بگـری بـەهانە
بــەهانە مــەگـرە و تـەشریف بـێرانـە

گەر بـۆ یـانە کـەم زیـز و کـەم لەشـی
وەک مـــاڵی خـــۆتە یـــانەی کـارەشی

ئیتر خـوا حـافیز هـەتا عـەسرێ دێـر
لەو دوا بـــە تـــەمام بتبـینم تـێر تـێر

**ئەم چەن شێعرەم لە ساڵی ١٣٤٨ای هەتاوی لە ئاوایی چۆلاخ نووسی بۆ وەسا فەرەجی خەیات لە قەلارووتەڵە**

# کێ تاوانباره

نیوەشەوێکە تاریک و نووتەک
دوو باسکی بینین دراوە شەتەک
پەڵە هەورێکی سامناک و رووتاڵ
گرم و گاڵی بوو لە حاستی یەک ماڵ
چەن تیرە بەرقێ کز کز دەسووتن
مانگی گیراوی لە نوور لا لووتن
ئەو هەورەڕەشە وای ترساندبوون
گرشەی لە هەنیەی هەموو ساندبوون
پەنگی خواردەوە خەو لە سینەی تەنگ
لە سەر دڵ چۆکی دادابوو، وەک سەنگ
قوشێکی کوڕووز شوومی کۆنە ساڵ
جار جار دەخوێنێ لە گوێسوانەی ماڵ
خەڵکی گەڕەکێ گەورە و بەر بڵاو
خەویان بەسراوە، چ پیر و چ لاو
لە تەقتەقانا[1] ئەو هەمووە ماڵە
دەڵێی گومەز و گۆڕی سەد ساڵە
لە تەقەی کەڵبەی سەگ و گورگە لوور
ترازا دوگمەی یێخەی خوێنی سوور
ئەو شەو لەو ماڵە هاوارێ بەرزوو
وەڵام دانەوەی پێویست و فەرزوو

---

1- نێوی گەڕەکێکە لە شاری سنە

وەلێ شەو گوێچکەی زووتر خنی بوو
ئاوی لە چاوی بیستن چنی بوو
شەو کەم کەم لە روو چارشێوی لاچوو
باری هەوری رەش لەو ئاشە داچوو
هەتاو لە ئاسۆی خۆر هەڵاتەوە
بە روومەت رنین دیسان هاتەوە
دیاربوو تیف تیفەی گۆنای نەدابوو
زەرد و سەرد و سڕ کز هەڵگەڕابوو
لەرزی تێ چووبوو لەو حەوا بەرزە
وەک کیژێ ڕێگەی پێبگرن هەرزە
چاوی سوور بووبوو، عەینی گۆمی خوێن
دەتگوت ئەم خۆرەو خۆری دوێنێ جوێن
دوێشەو وەنەوزی تا رۆژ نەدابوو
بە دەم لەرزەوە هەر هەڵچۆقابوو
شەکەت و ماندوو بێ تین و رەمەق
لێوی بێسرتە و دەمی بێ مەتەق
پەشێو چون کۆرپەی دایک ئاوبردوو
یاخۆ دایکێکی تاقانە مردوو
چونکە دەیزانی لەو ماڵە پەڕە
بەختی مەڕ بە دەس گورگۆ چەن شەڕە
کارەساتێکی وەها قەومابوو
لە عومری خۆرا، قەت رووی نەدابوو
هەرچەن ئەم باسە درێژ و دوورە
تەنگە نەفەسم لەم بەرە و ژوورە

بۆت ئەڵێم چی‌بوو، ئەو کارەساتە
چۆن شاگوڵی خۆر بەکیشێ ماتە
ئەو رۆژە هەتا قرچەی نیوەڕۆ
هیچکە لەو ماڵە نەیبوو هات و چۆ
ئاخر چوار براو خوشکێ لێو بە بار
جاران دەهاتن بە دەرکی حەسار
بە تایبەت چونکە باوەژندار بوون
لە دەر هەڵتوتاو، لە ماڵ بێزار بوون
باوکی دڵ رەقیان ژنی هێنا بوو
دایکی ئەو پێنجەی بۆ تەلاق دابوو
شەیتانی شەهوەت کوێری کردبوو
بە لەش زیندو بوو، بە گیان مرد بوو
بە هەرحاڵ خەڵکی لە یەک دەپرسن
دووبرا چوکۆڵەکە، ئاخۆ لەکوێ بن
خۆ دوێ لە پەنای هۆ ئەو دیوارە
دیار بوون هەتاکوو دەمەو ئێوارە
هەر لەو پەنادا براگەورەکانیان
شانیان دادابوو لەم شانە و شانیان
خوشکی دوو گۆنا سووتاو بە خەمیان
دەسووتا وەک شەم دوێ لە بەر دەمیان
لە خوا خۆش نایە نەپرسین لێ‌یان
تەقا و موشکلێ هاتبێتە رێیان
نەکا باوەژن لێیان تۆرابێ
دریا لە سەریان قوفڵ درابێ

دڵ بــه وەســوەسەی رجــا و خــۆفەوە
دەم بـــه هــــەناسەی بــەفر و تــۆفەوە
هــاوسێ و دراوســێ دەچـن بـۆ هەواڵ
بـــۆ چــاوە دێــری لە کــۆشێ مــنداڵ
کــه گـوێ هـەڵ دەخـەن لەدەر، تـۆزقاڵێ
نـــه زەرمــه جــلێ، نــه قــرم و قــاڵێ
ئــیتر چـــەن کــەسێ دەڕۆنــه ژوورۆ
چـــاو بـــه گــلۆپی دڵــۆپی ســوورۆ
تـــا دێـــنه مــاڵۆ دەشکــێ ئــەژنۆیان
دەتـــۆقێ کـــانی نــاڵەو رۆ رۆیــان
خــەڵکه بـۆ رەزای خــودا و پـێغەمبەر
وەرنـــــــه ژووروە مــــــەوێسن لە دەر
دوێشــەو لەم مــاڵه . . . . . . . . . . . .
بــه چــنگ و دەنـووک بەربوونە دەچـاو
شــەڕ بــووە لە بــەین فــریشتە و . . . . .
لە بــەینی پــەری و . . . . . . . . . . .
فــریشتە و پــەری لەش بــه کـۆڵه بـوون
. . . . . . . . . . . زاڵ و ســەرکەوتوون
دوێشــەو کــوژراوە عــاتیفەی ئـینسان
پـــێنجی پــێکاوە چــاوی نــاپاکــان
چـــپەی دڵـــۆپەی پـــڕ لە دیــوەرژنگ
لە چاوی جـوانـا، بـوو بـه مـێخ و سـنگ
چـــەقی لە جـــەرگی گــوڵوکی بــەهار
دانـــــی کـــولۆر و کــۆلکەی پــڕ لەژار

داخـــــی لە دڵـــدا ســەوزە ئــەمدەردە
گــەوهەر شــەل و پــار، پـلاری بـەردە
کــوولەکــەی رۆحـــی پێنج دانـە مـناڵ
تەقین لە ژێـر پـێ..............
(شـەخسە)ی پـاییز و مـانگی خـەزەڵوەر
وشکــی کــردووە گــیانی چــەن نـەفەر
قـــــــین دنــــــەدنەی .... داوە
تــا ســەو ئـارەزووی لە خـوێن شکـاوە
ژاری (هــەلایهەل) سـەممی ........
چــەن چــارە رەشــی کـردوون کـۆڵەوار
مــەکــری ...................
تـــۆقاندی دڵـــی تـــاقمێ هــــەژار
تــف کـرا لە رووی شـەرەف و نـاموس
تـــاوانـــی نـــرا بــەستۆی چــارەنووس
روومــەتی مــاتە (عــهدیە)ی بـێکەس
لە تاوی زەبری، سـەر پـەنجەی هـەوەس
داوێـــنی پـــاکـــی دڕاوە پـــاکـــی
لە پــەنای مـەیتی (خــالدی)کــاکــی
وەرن بـــزانـــن کـــێ تـــاوانـباره؟
هــۆی ئـەسڵی کـێیە بـۆ ئـەم خـەساره
بـاوکی دڵ نــەخۆش چـاوەڕتێ کـەر؟
چیلکەی تەنووری حـیلکەی حـەیا بـەر؟
یــا دایکــی تـینووی قـەساس و تـۆڵە
بــە ڕایـێ پـێنجی وا کــرد بــە کـۆڵە

یـا بـێ سـەرنجی و کـەم تەرخـەمییە
قـازی تـاقەتی تـاقیقی نـییە
بەڵگەی دەمـدەمی و هەرزە وەردەگـرێ
تـا لە ئـاکـاما پـێنجی پـێ دەمـرێ
یـا مـارە بـڕی بـۆپارە سـەرشۆڕ
(پـوڵ کـفن دەربـێ مـردوو گـۆڕبەگـۆڕ)
یـا خـۆ بـە چـەقۆی کـینەی بـاوەژن
ئـەم بـێکەسانە کـراون جـن جـن
یـا نـە هـەژاری لە بـاری بـیرۆ
کـردوونی بـە نـووک، پەیکان و تـیرۆ
وەیـا ئـەمانە هـەمووی پـێکەوە
کـامەت قـوبووڵە، بـۆ خـۆت لێ کـەوە
مـن خـۆم هـەر دوو گـوێم دەزرنگـێتەوە
هـاوارێ سـەردی تـیا دەتـلێتەوە
دەڵـێ تـۆ (کـۆلیل) شـاعیری خـەڵکی
شـاعیر نـووسینە بـەرامـەو کـەڵکی
نـەرمەلاوێنی خـاوێنی ئـەشعار
تـۆڵە ئـەستێنە، ئـەڵێن لە . . . .
لە زوانـی ئـێمە، ئـەم پـێنج مـناڵە
بـنووسە سـەحنەی دوێشـەو لەو مـاڵە
بـنووسە جـووتێ پـەپوولەی دامـاو
. . . . . . . . . . . . . بـۆی تـەنینۆ داو
(نـاسر) و (مـەنسوور) لفـە دوانـە بـوون
بـێ کـەسی نـەبێ لە کـەس دوا، نـەبوون

بوون بە خۆراکی . . . . . . . . . .
قەوی بە بێهێز لە مێژە فێرە
بنووسە مانای شفا و لاڵەمان
لە ژێر چەپۆکی مەرگا ناڵەمان
دەم بە گرینۆ لە پەسا پەسا
کەوتینە مل پای . . . . . . . . . . .
داوێنی پڕ پڕ دەخیل و ئامان
هێنراینە تکای بڕێ . . . . . . . . . .
دەرکی خەزێنەی ئەسرینمان شکان
بۆ چاوەزارو دەفعی . . . . . . .
بەڵام ئەو مشتە . . . . . . . . . . . . . .
زەڕڕە نووریکیان نەدی لەو خۆرە
بنووسە کاتێ دەس نرا بینمان
کاتێ کۆتایی درا بە ژینمان
کاتێ خەریک بووین بە شین و شەپۆڕ
. . . . . . دای لە ژێر قاقای تریق و هۆڕ
بنجی داکوتا زامی زوەی سەخت
لەسەر ئەنگوستی کۆلێ کولۆڵ بەخت
پێشەی شکاندین ریشەی مووە و ریش
لەشی سووتاندین بوین بە خۆڵەمێش
بنووسە جمگەو مۆرەمان چێ بوون
دوێشەو بە جارێ، لە گرێجەنە چوون
زامێکی لێدایین، ئەو شەوە، شەوە
هەرگیز گۆشتەو زوون ناهێنێتەوە

سکـــالأنامەی چـــەن ئـــاسکی پـــیٚشەل
بـــنیٚ مـــەحکەمەی بـــیرو بـــڕوای گـــەل
بـــپرسه بـــۆچی پـــۆلیٚ کـــۆیله و دیـــل
له ڕێـــــی هـــــەوەسا درانـــه بـــەر تـــیل
بـــه ســـەر هـــاتی مـــه، بـــڵیٚ ئـــاوا بـــوو
ئـــــاوا ژیـــــانمان له کـــەل، ئـــاوا بـــوو
لیٚـــــرەدا (کـــــۆلیل) بـــــڕیامه جـــاڵی
تـــــەمی ڕەویـــــاوو هـــەوری خـــەیاڵی
عـــەقلی ڕکـــەی کـــرد بـــڕناکـــا بـــیری
نـــــەچیر و هـــــەدەف نـــاپیٚکی تـــیری

ئەم نامیلکەیەکە وەکوو چێشتی مجێور وایە، واتە تێکەڵە لە وشەی جۆرا و جۆر، لە.مانگی خەزەڵوەری ساڵی ۱۳۵۰ لە ئاوایی چۆڵاخ، یەکێ لە ئاواییەکانی ناوچەی دیواندەرە، نووسیوە لە یەکێ لە مامۆستاکانم لە شاری سنەدا.

# میوانی چڵێس و چاوسوور

یــا رەب چــبوو لە بــەختم، لە نـێو شـەقامی شــارا
یــەکــێ نــەبوو بســـووتێ دڵــی بــە حــاڵ مــارا
هــەڵە لێــی هــەڵە کــردم دیــداری ئــەو پیاوەی
دڵســـۆزی ئـەم شـومایە و، هـەزار و یـەک شـومارا
چون بۆم نـەبوو مـویەسسەر گـوڵزاری رووی‌ببینم
بـــــهٰذِه الرِّســـــاله دردم کـــــــنم دوارا
بـــەر لەهــەموو ســلاوێ بــەبۆ وەکــوو پــلاوێ
دەس پــوختی کــیژە کــوردێ، لە نــەورۆز وبـەهارا
پێش‌کەش دەکەم، لە پاشان با عـرض کسب پـوزش
گــوێ راگــرە بــڵێم پــێت چــۆن چـەقیم لەبـوارا
(عومەر) شەوێ لە شەوان چــوو بـوو بـۆشەونشینی
نــابوویە ژێــری قــورسی، یکــی روشــن چــرا را
خــێزان نــەبوون لە مــالا، خــۆیشم نـەبوو لە بیرم
خــامۆشی کــەم هـەتا کـەس، نـەمباتە ژێـر چـرارا

حـــــینالرّجـــــوعِ الی البـــــیت البـــلاء دیـدم

آتش گشـــــوده آتش بـــه مـــــالّی بـــــەرد و دارا

لێـفەو بـەڕەو کـەواکـەم، لەگـەڵ جبەی مـەلاییم

دووکـــەڵ دەکـــەن دەسـووتن، وەک قـاوی کـابرارا

یەک دوو کتێو کە هـۆ بـوون بـۆ قـووتی لایـەمووتم

ئەوانـەش هـەڵدەقرچـان، لە کـوورەی گـەرمی نـارا

زدم بـر فـوق فـرقم کـوتم هـەی هـات هـەی هـات

ئـــەی مـــەردومان خـەبەردار مـن و لطـف شـما را

ئـــەشا ســـەرما بـــە ســـەرما، چ بـــەزمێکی دەرێـنا

لهـــــیب آتش امشب مـــــەلا راشـــــد بـــــلا را

مـــیوانـــێکی چـڵێس و چـاوسوور وەکـوو دەبینن

خـــوراک خـــود نـموده نـیسک و بـرویش و چـارا

پـــیاز و نـۆک و هـێرەڵ، برنج و مـاش و کـەشکم

ئـــــاڵەت و زەردەچـــــێوە، لەوێـــــچێ بـــــاقلا را

دوو کوولەکەی دیـاریو بـرێ چـەوەندەر و تـوور

مـــەنێ تـــوو گـــوڵە بـەڕۆژەو کـــیلۆیێ مـوربیا را

هەڵووژەی وشک و قەیسی، کشمیشی زەردی بێناو

لە ســـێ چـارەک زیـاتر، تـۆزێ لە خـواری چـوارا

قەن و بەن و کەل و پەل، دۆینە و شەلەم لەپەو تـرش

پـــــەپانە قـــــیپە دێـــــزە، مـــلیان نـــاوە بـــە لارا

لۆکــەی لێـفە شـەماڵم، ئـاگـری بـەردا لە مـاڵم

چون چەورە خۆش دەسووتێ سادەی ئێوە و خدارا

زووتـر بکـەن مـەهاری تانەیسووتاندە خـۆیشم

جـا سـاڵێتر وەرئـەگـرم سـەرفیترەتان لە بـارا

چونکی لە من هەژار و بێ ئـەنوواتـر، ئـەوان بـوون

ایـن مـژدە تـا شـنیدند، هـەڵچوونە سـەر دیـوارا

وەکـوو هـەوری بـەهاری، دایـانە بـەر مـوسەلسەل

بـە گـوللەی ئـاوی سـەردی خـەزەڵوەر لە شـەوارا

وا ئـیستێ رەمـەزانـە. بـیستی لێ تـێپەڕیوە

خـەڵکی فـەقیری دێکـەم، هـەر وان لە ئـینتیزارا

لێرە و لەوێ دەپرسن ئـاخۆ بـۆ هـەر سـەرێ چـەن

مـەلا پـارەی سـەرفیترە، دهـێنێتن بـەزارا؟!

مـنیش بـە وعـدە گـیرم وەڵـی بـۆ پـارە پـیرم

فَـقَدْتُ عُشّ عَـقلی تـرانـي کـالحُبارا

لە لایـیکۆ کـە رووتـم لە سـەرما هـەڵ ئـەتووتم

لە سـەرما کـەی دەمـێنێ چ قـەوڵمدا، لە پـارا؟

کـوردێکی ئـاوەڕووتی دڵ و دەروون پـڕووزاو

کـێ راستی کـرد لەگـەڵیا هـەتا راس بـێ لە کـارا؟

وەخـتێ حـەسیرە کـۆنی مـزگەوتم ژێـرە خـەربێ

وەعـدە ئـەنێمە چـاڵێ، بـا بـمرێ لە پـەژارا

له لایـــیٚ‌تر ئـــەوانـــەش کـــە قـــەوڵم داوە پـــێیان

مـــــاڵیان پـــڕیە لە خـــاڵی، وان لە فـــەقرە هـــەوارا

تەلاش و رەنجی گـەنجی کـوڕ و کـچی بـە جـاریٚ

قـــوزوڵقوردی تـەزوێحەو لفکـەو چـەتفە و کـەوارا

مـــێژوو ئـەڵێ کـە کـوردان، لە رۆژێکـۆ پـەیا بـوون

کـــــردەی ئـــەوان و بـــردەی شـــەیتانی وا لە کـــارا

بـــــە یک اشـــــارە از تـــو مگـــر چـــارە بـــجویم

کـــدامـــین را رەهـــا کـــەم خـــودم را؟ یـــا فـلا را؟

## گوڵی ئاخ

شیعرەکانم بەستەی شینن ئاراستەی دەستەی بێ‌تینن
گوڵی ئاخن لە سەرگۆڕی، کۆڕێ لێ‌قەوماوا، شینن
خونچە گوڵی زەرد و سوورن، عەینی خوێنن، خودی دەردن
ئاوی چاوی ئافرەتێکی بێکەس، لە زستانی سەردن
مەتەرێزێکی رووخاوی، کوردێکی ئەژنۆ شکاون
سووارەی فرمێسکن
لە لێژی روومەتمدا هەڵگلاون
چاوی خوێنینی شەوەقن، لرخەی قوڕگی «اناالحق»ن
دواپین ترپەی، سینگی تەنگی
بێ‌ئاکامی رەق و تەقن
تەقەڵی درووماتی جلی هەتیوی گیان بوو بە ملن
کفنی کۆن و کەم و کووڕی،
تەرمی لاوێ نەرم و شلن
جۆگەی بێ‌ئاوی پڕۆ بووی، پڕ لە خۆڵ و خیز و خاکن
چاوەڕوانی هێزی
پاچ و بێڵی جۆماڵکەرێکی چالاکن
بریا و خۆزگەی جێ نەهاتوون، تاسەی تاساوی ساردۆ بوون
شاخەوانی سەرنجێکی
بە لووتکەی بەردۆگیر خواردوون

لە سەرکوڵمی هەست و هیوا خەت و خاڵێکی سڕاوەن
لە مل کیژی مژۆڵمدا
ئاقێق و مووروی چڕاوەن
کەژاوەی خاڵی لە بووکن
هەرچەن بەختی ڕەشی خەیاڵ،
زاواییێکی بەتەما بوو
هەرگیز بووکی نەهاتە ماڵ
پەری جوانی دەقی سەرگۆنا شکاون، بە لێوانێ
کە بۆ دڕنی دەخنکێنێ گەرووی کووژاڵکە کێوانێ
دەمی دووراوی گڕوگاڵی منالی شیرە خۆرن
باڵە تەپیی کۆتر و کەوی
دیلی داوی جۆراو جۆرن
لە سەرەڕێی بای زمەنا
قنگلاشکی بێمەوتەنن
دەربە دەری وڵاتێکی هەرە دوور و بێکەوشەنن
چاو قرتاندنی دواجاری
ئەستێرەی ژینی پیاوێکن
لە ئاخرین ئاویلکەشا، تینووی سەرنجی چاوێکن
بوڵبوڵێکی کز هەڵنیشتوون، لە قەفەزی سینەی خەما
بەنەوشەی لارە مل و بێ ئاون،
لە قەراخی جۆگە و چەما
بەژنی بەرز و ڕێک و پێکی گەنجێکن،

سەر بە دارۆیە
ئەوەی قەبری لە دڵمایە، مایەی وشەم بە زارۆیە

تاڵەی رەش و دەنگی ناڵەی دڵی ئاوارەی شەکەتن
هاواری خاوو خێزانی لە ژێر ئاوارا لەت لەتن
لە هەڵەبجەی وێرانەدا، لێوی ئاڵن، قژی کاڵن
پێکەنینی دەمی برینی، شەهیدی بێ هەواڵن
مانای وردی، نووکە نووکی،
کیژە کوردی بێ گوناحن
ئەوانەی وا لە سەردەمی سەدەی بیستا خوێن مەباحن
قیژەی مناڵی شارانن شیعری بێکەس وەبیر دێنن
(من مناڵم دەرم بێنن، تۆ خوا ئەگەر بم سووتێنن)
هەڵمی خوێنن،
زاری زامی بە ناسۆری بێ‌هەتوانن
بارمتەی خەمی بەرهەقی، ناهەق دەرهەق، بە نەتوانن
قرچەی دڵی دایک و بابی، تاقانە کوڕ لە دەس دەرچوون
یا دایک و باوکە رۆی کچە نازدارێکی بێناز کەوتوون
بەلاّم هێشتا بەم حاڵەوە،
شیعرەکانم، بەڵێن دارن
چقڵی چاوی راست و چەپی، سپی و سووری، ئیستعمارن
هەتیوێکی قیت و زیت و هار و هاج و چەقاوە سوون
ئاوڕووبەری هەر کەسێکن، بێ‌حورمەتە و چەتوو چەتوون

وەجاخی رۆشنی مێژوون، بۆ نەتەوەی گەلەکەمان
بەمان هیوادەرن بەمان
بەوان دەگرن رێگەی ئەمان
بەڵێ تاقەداری دەشت و کەویرێکی چۆل و هۆڵن
بەلآم بە تاقەت و زبری و سفت و سۆڵی گۆیژەکۆڵن
گیرفانی پڕفرِو فێڵی چڵکاو خۆرەکان دەبڕن
جەرگی درۆی زلی خێڵی چاو شینەکان هەڵئەدڕن
رۆڵەی نەترسن دەپرسن،
لە نەتەوە یەکگرتووەکان
ئەرێ مافی بەشەر چییە؟ وتووتانە بە مەومانان
شەرم مەکەن
سوێن و ئەدەم بە گیانی دۆلار و فرانک
بەوەی ئەقڵ دەکاتە خەو
شەرِەف دەخاتە شانکەشانک
بلێن تەڵەیە
کەڵەکە، هەڵەکردن لە هەرگەلە
تۆپە، گوللەیە، تفەنگە، بۆمبایە، گازی خەردەلە،
تاقیکردنەوەی مووشەکە،
وەرِەی سەگی فڕۆکەیە،
قڕکردنی ژن و پیاووکورِ و کچی هەڵەبجەیە،
ئادەی سادەی بادە، سادەی
هەرچەن نابێ بۆ ژینی من،

لە مافی مافیا لادەی
شەرم مەکە
مافی بەشەر بلێ چییە؟
قانوونیە ـ یا فڕو فێل و فیفیە؟
یاخۆ گەڕە؟ شەڕە؟ ئەشکەنجەیە؟
سووتانی هیرۆشیمایە؟
مردن بردن بۆ سەبرایە؟
یا نە قەلاچۆکەی شەتیلایە؟
شەرم مەکە بلێ
مافی بەشەر بایەو کایە
بۆ (کان)ی زێڕ و زێوەکەی ڕەشەکانی ئافریقایە
مافی بەشەر لە قوڕنانی بەهەشتێکی وەک لوبنانە
شالاّو بۆ خلیجی فارسە هێرش بۆ خەڵکی ئەفغانە
مافی بەشەر
حەقی «ویتۆ» دانە، بە زۆر بە زەڕ
لە عاسمان، لە سەر زەوی لە کەم، لە زۆر لە وشک و تەڕ
وکوو ئەوەی بەشەر نەبین مافی بەشەر بۆ ئێمە نین
بۆ «رووس»ە، بۆ «ئامریکا»یە
بۆ «فەرەنگ»ەو «ئینگلیس» و «چین»
مافی بەشەر
لایەنگری بەشەر کوژ و چەک بە دەسە
نێوی پەیمانی ژنێوو منێو مەبەن

جنێو بەسە
ئادەی خەڵکی دنیا ئێوە بڵێن
مافی بەشەر ئەگەر ئەمانە نین
ئەی بەس چییە؟
ئازادییە؟
بە ناو نیشانی فەلەستین !
شیعرەکانم پشوو نادەن لە هەر مەرج و چەل و هەلا
تاخۆر دەس لە ملی گەلم نەکا
لە ئاسۆی ئەمەلا
شیعرەکانم
پاڕانەوەی (کۆلیل)ێکن لای خودادا
شمشێری تۆڵەئەستێنن لە دیوانی عەدڵ و دادا.

**سەقز ١٣٦٧ای هەناوی**
**بە بۆنەی شەهید بوونی حەڵەبجەوە.**

## باوانەکەم! با، وانەکەم

لەکورۆکی خوێن و ڕەگما
خرمەی بارانی فەڕوپیت دێتە بەرگوێم
لەسەر فەرشی باڵی فریشتەی پاکیدا
دێم و دەچم و بۆ یار دەدوێم
پەڕەسیلکە تازە پەڕەوازەکانم
بە سەوزە پەڕ،
تیمار دەکەن زامی بە سوێم.
ئەمشەو تاسە بە تاشای دڵ
خاڵی لاڵی لێوی خەیاڵ
بەگوڵی ماچی ئارەزو دەکەن بە بووک
باڵ دەخشێنن، بەسەر هێلکەی تۆقلەکانی دەروونمدا
کۆترە باریکەی ئێسک سووک
ئەمشەو وەکوو پەری خەونی کوژرا و
گیانی ژیانی دەزێتە لەش
دەگەشێتۆ وەک گوڵی گەش
شاگەشکەی شەپۆلی خۆزگا
گلێنەی دڵی تەماشا
بۆ بەژنی فەسڵی بەهاری ئازیز

دەگرێتەوە باوەش .
ئەمشەو ئەستێرەی بەربەیان
پرپرە و پوولەکەی ئاسمان
لە پۆپەی داری تووبادا،
چاو لە شەوبۆی لووتکەی ئەمەل دەقرتێنن
قەناری و قومری وتووێژ
لە هێلانەی قوولّی هەولّی هاولّەی هەناسەکانما
زریوەی شادی بەگوێی سروە ئەسرتێنن .
ئەمشەو ملی دژایەتی
لە رەشماڵی دڵلاّریما دەخنکێنم
دەیکەم بە پەتی هەڵبەستا
شووشەی پڕ لە عەتری شەوبۆی، زەماوەنی برایەتی
دەرژێنمە دەستی هەستا .
ئەمشەو بە ئاوی یادگار
روومەتی مۆنی نامۆیی دەشۆمەوە.
لەو خالاّنەی وا ناحەزن
دەسوتێنم دەمی ئەوەی بڵێ :
مەلەک
بۆ تەماشای بەژنی ئەوین
لە سەر عەرش‌دا، نابەزن، دانا بەزن .
تاکوو ئەو شەو، وتووێژی وشکی

لێوی نیگای شان کزو مل کەچم
نوقمی زەریای تارمایی بوو
هاواری دەردی ترنجاو، لە ناخی تەنگی مێژوودا
دۆعا و نزای نەزاو، تووشی نازایی بوو.
بەڵام ئەمشەو، رۆحی مەعدوومێکی زیندوو
ئاوی ژینی ئاژین کرد لە باخچەی هونەر.
ملوانکەی خەرمانەی لە مل مانگ دەرهێناو
گێڕای بە جەغزی نەفەسی سیحری سەحەر
بۆیە منیش سامم شکا، زوانم بەربوو
لەگەڵ شۆڕە سوواری شەقڵی شەو شکێنا
بە شەرمۆکەوتمە گفتوگۆ
پێم وت:ئەی هاوشانی شکۆ!
ساچونکە لەناو باڵەخانەکەی چەما،
واتە جێ دیوانەکەی تۆ
بەرزە لە باڵی پەپوولەی شابەیتەکانت، بۆی بۆسۆ
وە لە تۆ تۆی زێڕی باڵیان نییە تۆوی بۆ من، تۆ بۆ؟!
بەڵێن ئەدەم هەتا ماوم وەکوو دەڵێن
هۆنراوە نەکەم بە ناڵی ئەسپی سوڵتان
یا بۆ سوێلەکەی بە قەیتان
دەبم بە شاگردی ئێوەو
دەیکەم بە ئایەتی قورئان

دەیکەم بە چەکی گیان کێشان
مێش دەگرم لە نیشانەی سەر تەپڵی دڵی دێوی شەیتان
ناڵە ناڵی شەوانەتم، لە واژەکانت بیستووە
بۆیەکانێ بە ئەو پەڕی ئاواتەوە
حەزم دەکرد نەی ببوایەم
تۆمارگەی حەی حەی ببوایەم
گۆرانی وەی وەی ببوایەم
نەشئەی نۆشی ئۆخەی ئۆخەی
لە بەر نێشی، حەی ببوایەم
حەزم ئەکرد هەموو گیانم هەر گوێ بووایە
ریژنەی بارانە پاکەکەی
موناجاتی شەوانەتی چەشنی لمی لێوی کەویر
هەڵلووشایە
حەزم دەکرد لەم دونیادا وەکوو تۆ بم
دەس بە ئەژنۆی سەر گڵکۆ بم
دڵ بنێژم لەگەڵ لەیلاو، کە چی هێشتا دەم بەگۆ بم
حەزم دەکرد دڵم ماڵە رەشایی بێ‌و
کرێنشینی گوڵ نەکاو
هەرگیز چاو نەبڕێ لە ئاوەنگ
لە سەر حەسیری پەراسووی خۆی بخەوێ
با ژیانی بە منەتی گوڵ، نەبێ تەنگ

چون چاوەڕوانی سەرچاوەن شەت و رووبار،
پێم خۆش نییە جۆگە و چەم بم.
دەمێ مووچە خۆری شین و
کاتێ سوورو
بەینێ ڕەش و
ساتێ ئەوو جارێ ئەم بم
حەدم نەبێ خۆتاسایی
پێم خۆش نییە قرت و چەو بم
سەرەڕەو بم
نۆکەری خواردن و خەو بم
قەڵەمەکەم بەم بە سەلەم،
خۆمیش لەرەهن و گرەو بم
دەمەوێ کانی و ئاوێکی پڕ لە هیوای زۆر و کەم بم
لانیکەم چەشنی زەمزەم بم
بمکەنە نێو شووشەی نەجات
لە سەر کڵی دڵی عەشقا،
چاتر لە عەتر و بۆی بەهار، تازە دەم بم
لەگەڵ خۆما زۆران بگرم،
هەر چنگاوشی خۆم و، پێخەم بم
پشتی نەوسم بدەم لە خاک
یەک خەم کەمە،

پێم خۆشە بۆ خەم دوو خەم بم

پێم خۆش نییە کوشتەی خاڵی لێوی ئاڵی زینی مەم بم

یا عەوداڵی ئاوی ژینی

چاڵی چەنەی شیرینێکی شەکەر دەم بم

وە یا ناڵە ناڵی بێژەن

لە نێو چای تاریک و قووڵا

بۆ سێوی لێوی مەنیژە و

بۆ زەبری دەستی رۆستەم بم

تەنانەت نامەوێ مانگی یەک شەوە بم،

لە حاستی خۆر کڕنووش بەرم و

کەوان ئاسا کۆم و چەم بم

قەت ئاواتم نەخواستووە ببمە شەونم

گوڵ بم کاتە عەینەکی چاو،

لە سەر چەم بم، لە بەر چەم بم

من کە دڵم عەرشی خوا بێ

قەدرم دەشکێ،

گەر حەز بکەم جامی جەم بم

لە رۆژێکۆ راست و چەپی خۆم دەناسم

حەز دەکەم دەستی عیسابم. پێم خۆشە گوڵی مەریەم بم

✧ ✧ ✧

ئەی کۆڵەکە زێڕینەکەی

بارانی خەستی ئاسمانی سەوزەڵە
ئەی عەقیدەی مەرزیەکەت
شانەی پرچی کیژی کازیوەی حەوسەڵە
بێتو دڵم ساڵێ، مانگێ، یا حەفتەیێ، ڕۆژێ،
شەوێ دەقیقەیێ، سانیەیێ، کەمتر لەوەش
خەیاڵاوی، لە شوێنت شوێنی نەکەوێ
چەقۆی قاری لێ تیژ دەکەم،
سەری دەبڕم، وەک چۆلەکەو، زڕەکەوێ
بێتو لە تۆ جیابینەوە شیعرەکانم
وشک و زڕو، گێژ و وڕو، شەق و شڕو، مات و کڕن
بۆ بووکی بیر نابن بەگوڵ و گوارە و مێخەک
ناشیرینن، روویان نییە سەر هەڵبڕن
ناشیرینی هەڵنابڕن
ئەگەر بێتو دەستم نەگری و،
نەڕژیتە ناو دارستانی باوەڕ و زەین و خەیاڵم،
نەتکیتە ناو گەرووی تامەزرۆی تەشبیهم،
لەگردنی ئاسکی ناسکی
باسکی جوانی راو بەتاڵم
خەم وە ئەبرۆ ناخەم
ئەگەرچی لە دنیای چارەنووسما قات و قڕیێ
لە نێو سینەم هەور و هەڵای برین

تەمی نەڕەویتۆ و، گوڵی گرین دڵی پڕ بێ
جا بە تاو هەڵچۆڕێتە سەر مەزراو
مەزرەعەی مەزاری گوڵە عەنبەر و خاتوونا
راکێشن رەگی حەیاتم، وەشوێن هەتیتەی حەسرەتا
ملی دڵم کەنە پەتا
تا وێنەی تۆ خۆم پەیاکەم
لە تووناوتوونی نەبوونا
باکم نییە غەریبێ بم لە هەندەران
هیچماڵێ شەو رێم پێ نەداو،
بنوم لە مزگەوتی دێدا
بەو مەرجەی بۆی کزەی جەرگی
پیرێکی پەسەک لە بەری ببێ تێدا
بە درێژایی مێژوو، وەکوو دارگوێزەکانی هەورامان
رابوەستم ببمە کێشکچی تا هەرمان،
بێ پشودان
هەر وەک خەلاّت کرابێتم وایە،
ئەگەر بشنێمەوە
بۆ سڕینی عارەقی سەرگۆناکانت
گەلاّکانم حاڵیان لێ بێ
بە چریکەی سیاچەمانەکەی
باخی ناخی پڕ لە عەتر و بۆی عیرفانت

تۆ ئەو گەنجەی وا لە سەردەمی گەنجیدا
دەچووی بە گژ داری سەروا
سووکتر لە رۆح بە ئاسانی،
بۆچی؟!
بۆ دەرهێنانی هێلانەی مەلی هەتاو
بۆ گرتنی بێچووە نوور و گرشەکانی
پۆل پۆل لەو بێچوانەت ئەوەن دەستەڵێن کرد
لە بەرۆکو باخەڵەتا
هەتا، هەتاو، خۆیشی لە سەر سینگت رووا،
لە ئاسۆی لێوتەوە هەڵات
بەرق بۆ بابا خەڵەتا

✧ ✧ ✧

ئەی هەر لە دین درووس کراو
گیانم گراوی گرینە چەشنی کەواو،
کاتێ ئاگرپێکەنێ بۆی
بە فرمێسک کلۆکۆم دائەمرکێنم،
رازی بەینی خۆمو خەفەت نادرکێنم
قافڵە سالاری، ئەم کاروانە چونکا تۆی
لەو کاتەوە مەحرەمەکەی موحەررەمت
لە حەرەمو، خەڵوەتخانەی، تەنیاییدا، ون کردووە
لەو کاتەوە

ئەڵقەی خولامی، پەژارە و مەرارەتت
لە گەردنی من کردووە
بۆیە کانێ لە ژێر چاوەدێری خەمام و،
کەس ناتوانێ هاتووچووی ئازارم لێ قەدەغەن کا.
ئاخر بازاڕی ئازاریش هەر ئەوەیە،
عاشقی شینی شاعیرانە و
پێی خۆشە بۆ خۆی شیوەن کا
لێم ئایێنە،
تا مانگ و رۆژ هەڵدووراون بە سەر سوخمەی عاسمانانا
تا دڵۆپێ شیر بمێنێ لە ناو گوانی کاکێشانا
تا گوارەی ئەستێرە شۆڕە
لە گوێچکەی حەوتەوانانا
تا رۆژێ پەرچەمی پەخشو پەرێشانە
بە سەر شانا، ریشە و مانا
تا شیعرێ چاوی دادەگرێ،
لە بەژنی زامێکی بە سوێ،
سەرۆکایی بە ئازارە، لە جەرگەی ئێمە و مانانا.
بۆیە کانێ هەر شاعیرێ
پەیکەرەسازی ئازارە لە وشەی جوان
چونکا کەسێکی تر وەکو ئازار و غەم شیعری نەدوان
لە هەندەرانیشا هەر ئەو بۆی هاتە ژووان،

له بۆ هەمووان، نەک یەک و دووان
بۆیە دوو گوێی ئیتاعەتم
گرمەگرمی هەوری ئازار ئەخواتەوە
چون هەر ئەو لە بەر ئاوێنەی ئەسرینمدا
خۆی دەق ئەداو
سەر و زوڵفی ئەشواتەوە
بۆیە کانێ بە برژانگی چاوەکانم،
پرچی ئازار شانە ئەکەم،
باوانەکەم!
ئاخر کەسێکی تر نییە لە سەر سینگم هێلانە کات،
با،وانەکەم.
ئاخر کەسێکی تر نییە
دەرکی دڵی بۆ شاعیرێ بکاتەوە،
لانی کەم شیعرەکانی شارەودەر نەکا
تەقەی کینە و خەتەر نەکا،
ئاورِی وسکوت نەداتەوە و
پەیکوڵ لە بەر پای هەڵبەستا، لە مەر نەکا

✧ ✧ ✧

ئەی قامووسی پڕ لە وشەی بە ناموسی حەیا و شەرم
پەڵە هەوری رەستەکانت،
تا دائەکەن بە سەر بێسانی بیرما، نەرم نەرم

دەستی دەشتی مێشک و سەرم
پڕ لە لیمۆی زەرد و
شەمامەی خەت خەتیو، بۆن دار ئەبێ
لیمۆیێ کە بۆ پێشکەشی دڵدار ئەبێ،
شەمامەیێ کە بۆ سەر خەرمانو جەژنی بڕیار ئەبێ
وەلێ تا لە بڕکەکانی دەیکەنێمۆ
تاقمی مونتاژگەرەکان،
لێمی دەکەن بە گرکەی بڵ
لێمی دەکەن بە کاڵە کەمارانە، پێستی شڵ،
لێمی دەکەن بە تەماتەی سەرمابردوو،
بە کەلای گڵ
وەلحاسڵ، لێمی دەکەنە، ژانەزکو دەردی سپڵ
لێمی دەکەن بە چڵەی چاوی شەواری شەوارە کردووی ئێشو چڵ
منیش تەمرینی تۆڵە کردنەوەم نەکردووە
سەرم هەوای تێدا نییە بۆ قین و قار، بۆ گیر و دار
ئەینا دڵ شکاوان دەڵێن
دڵێ کە بوو بە دوولەتۆ
بۆ دەرهاوردنی دەمار،
تیژتریکە لە زڵفەقار

✧ ✧ ✧

ئەی ئەستێرە رووناکەکەی

بەر بەیانانی سنووری دین و ئیمان
ئاشناکانی ئەم دەمە بۆنی غەریبەیان لێ دێ،
ناشناتر لە ناشنان
بوو بە هەرێز بنجی کوتا لە خوێنما،
داخی عاشقەکانی ئەم دەمە
قاژە رەشە دمەلاسکێی کۆتری حەرەم دەکاتەوە
بەرزە هەرای گمەگمی گاڵتە و گەمە
ئەوین ئەمڕۆ چاوە چاوی
بۆ پارەیە، بۆ ماشێنە، بۆ تالارە،
بۆ کچێکی مۆدپەرستی خۆ لە رەنگا هەڵژەندووە،
بۆ نەیارە، بۆ لاسارە
لە لایێکۆ لە نێوانی ئەو دوو عەشقە درۆیەدا
وشەی جوان جوان پێشێل ئەبن
ئەلۆ ئەلۆکانی، پشتی تەلەیفونی هەوەس
پاکیان چاو خێل ئەبن
باش‌تر بلێم دیدەی مەستی هۆنراوەکان
پڕ لە خۆڵی گریان ئەبێ
بریا نەبێ
زوانی پاڕانەوەی دەشکێ
قسەی ناخی چۆڕاوی دێ،
مەگەر خۆزگە و بریا، نەبێ

لە لایێکی تریشەوە ئێستەکانێ کەسانێ هەن،
رێ بەکاروانی هەڵبەست و شیعر دەگرن
باج ئەسێنن
زۆرێکیان لێ شەهید ئەکەن
ئیتر مۆری خۆیان بە زۆر
بە ناسنامەی ماباقیدا ئەچەسپێنن
مانگە شەوی کرچوکاڵی قەسیدەیێ یا غەزەڵێ
بێتو هەڵێ
دەمبە دەمێ، لە قەڵەمێ
یا لەکەلی دەمێ چەلێ
گەلێ بە فێڵ و فەرەزۆ، لێی دەچنە حەلێ حەلێ
ئەیانەوێ کە پەریە سپیلکەکەی مانگ
لە نێو دەریای شین و مەنگا وەدەربێنن
رەنگی هەش و بەرگی رەشی، کافر بوونی کەنە بەرداو
لە حەوزی لیخنی کوفرا بی خنکێنن
ئەمانە بەم خەیاڵانە، پڕ و پووچ و بەتاڵانە
ماسی فێرە مەلە دەکەن
دەیانەوێ شیعر ژوورو نووری نەبێ
بەڵام دیارە کوێر کوێرانە، لە پەکوتێ و پەلە دەکەن
ئەیانەوێ وەک چۆلەکە
رۆژێ ملی هەزار هەزار مەلی هۆنراوەی بەرزە فڕ

هەڵبکێشن
چرای هەڵبووی چاوەکانی هەڵبکۆڵن
بە شایێنی خۆیان هەرچەن سەریش بکا
وەزن و کێشی بۆ بکێشن
ئەوا ئێستا چەشنی دەستی چەوساوەکان
چەوساوە نەحەساوەکان
دەستی دڵم قڵیشاوە
ژانی قینی لێ دەچۆڕێ
لە داخی ئەم ڕێگرانە
ئەم چەتانەی دەخڵ و دانەو
ئەم چەتانە لە سەد لاوە
بەم بۆنەوە، بەڵێن ئەدەم
عومر ئەگەر مۆڵەت بداو، بەهارێکی دی بێتەوە
بەفر لە سەر دڵی گوڵی دەشت و دەمەن،
بتوێتەوەو بچێتەوە
کەند و لەند و، دەشت و چیای وڵاتەکەم،
هەموو لایێ دەپشکنم
چی وەردی بێ گەردی لێ بێ
بۆ خەڵکی شارەکەم سەقز هەڵئەچنم
هاتو گوڵم دەس نەکەوێ،
ئیتر لە تەپۆڵکەی سەرما

با جێ نەمێنم لە خێرا،
خێرا دوو چاوم دەردێنم
ئاخر من شاعرێکی بێناو نیشانم
بەم کارە ناوم دەردێنم
ئەمجارە مێژوو دەنووسێ
لە کونگەرەی مەولەویدا
شاعیرێ بوو کز و کۆلیل
چرای چاوی لەسەر دەستی ڕاگرتبوو
بۆ ڕێزی خەڵکی شارەکەی
نەبۆ بەرتیل

**سەقز ـ خەرمانانی ساڵی ١٣٧١ی هەتاوی**

**بە بۆنەی کۆنگەرەی مەولەوی کوردەوە.**

# قیر و بیر

خۆزگا لە دایک نەدەبووم، یا کە دەبووم سەرم دیدەی تیا نەبوایێ
با شەقامی گۆڕینەوەی تەماشا، بۆ نێو دەروونم نەکێشرایێ

یا خۆ بەر لە دایک بوونم، دوو گزموولەی چاوەکانیان هەڵکۆڵایەم
تووشی چەرمە سەرەی ئەوین، گێرەو کێشەی بێبڕانەوە، نەهاتایەم

شەڵڵا پوورەی شەنگە سوورەی دڵداری، لێم نەشلەژایێ بۆ بێ حاڵێ
چوار مێخەی دڵیان دەکێشام، بەر لەوەی خورپە و سۆزی دڵ پێما ئاڵێ

دەزانی بۆ؟! چونکو هەرچی سەری هەوڵمدا بە هەزار دار و بەردا
دەستی ئاخر داڵدەی نەدام خۆرەتاوێ، تاوێ لە زستانی سەردا

باڕێزی تەشەر و تانە بە دارستانی لەشمەوە گەڵای نەهێشت
ماسییە سوور و سپیەکانی خوێنم، سەرما کولانیانی، کردنی بە چێشت

جارێ نەبوو سەرم بنێم بە سەر سینگی مێخەکبەنی بەهارێکا
بوو بە قوڵپەی هەناراوم، خەوێ خۆشم ئەگەر دیبێ لە جارێکا

گیانی تینووی ئاوی ئاوڕی خۆشەویستیم کەوتە بیری چارەی نەجات
بۆیە دەمی تاسەی خەیاڵم نایە ناو دەمی، فێنکی بووکی حەیات

کاتێ بینم لێدا، زارم پڕ بوو لە لم، تازە زانیم تراویلکە بوو
پــێی لێ ئەنێم خەیاڵیشم، بە چاویلکەی دڵم روانی و ساویلکە بوو

وەک عەرزی عەزرەتی وشکە بەهارێکی بێبارانم لێبەسەر هات
هاژەی رەشە بای تون بێتە وێزەی پەڵەهەورەکانیو راماڵی دات

کوێرە رێگاری رژد و لێژم، دەڵێێ رەشمارێکە پڕ لە قۆرت و گرێ
لەهەر هەڵبلۆوتیانێکیا، سەد بێچووە ژاری لە لەشما پێ دەگرێ

دەموت کەروێشکێ رەوەکم، خپ ناخەوم راوم بکەن خلیچک و خاو
نەم دەزانی خەو دەبارێ، لە عاسمانی شەکەتی دڵ بۆ گیانی چاو

رمووزنێ رۆتاڵم لێ بوو بە ئاڵ و بەستی باڵی هێز و تینم
دەرمانی گیان دەرهێنانی دادەرخواردی چون بۆ ژوانی، جوانی ژینم

کە بەم جۆرە شەو نخوونیم پیا هەڵشاخاو بووم بە چاوی مۆتەی ژانۆ
ئیتر مەرگی کامەرانیم بە تاشای دڵی دەرد و غەم دەلاوانۆ

وەختێ تەنگی پێهەڵچنیم، سەنگ و شەوەی سوخورمەی شەو، گیانم نەوی
دەرەختی غەم، لە بەر بەرو گۆپکەو چرۆ ، لق و پۆپی نایە زەوی

هیچکەم نەدی بێ بەلاما، تاقە کەسێ دۆزیمیەوە تەنیایی بوو
شیوەن دەستی بۆ هەڵبڕیم، شادمانی لە حاستمدا کوێرایی بوو

تۆش ئەو کەسەی سیپەلکی دژم دادابۆت، بۆم بە دەرکەو، کەوێ شاشی
بۆ گیردانی دانەوێڵەی عیشقی پاکی ئەمن ناشی، دەم هەراشی

هەڵدێری تەماشام هەرچەن ملی قەترەکانی شکاو شی کرانۆ
وەکوو پۆدری زێوی سپی، هەمووم کردە زەرەوشان و شاواشی تۆ

لە بێخەوشی نیگاکانم، هاتبوونە سەیر، فریشتەکان، حۆری و پەری
وەلێ تۆ هەر ئەڵێی لە سەر سنووری سەیری چاوەکانم کۆچەری

گەلێ جاران سواری ئەسپی کازیوەی پاڕانەوە بووم، بە تاو، بە غار
چووم چاوەزاری قەندیلی نوورت، لە ژوور عەرشی خودا بۆ بێنمە خوار

بەڵام کارێکی واتە کرد، بوو بە تەڵەی تەقی، دەمی دۆعاکانم
دریانە بەر تیری شەهاب، ئەسپ گلاو زوانی شکا، سواری زوانم

قەڵەم سەد ژان ئەبژێرێتۆ، تا کۆرپەی وشەیێ ئەزێ رەوان و سڵ
هەزار هەزار لەو کۆرپانەم لە بەر پێتا سەر بڕیوە بە گیان و دڵ

ئەمما تۆی سەر سەری رۆحی پاکی ئەو کۆرپانەت نەدیم، لەبەر غوروور
فبتُ كالّذی اَعْطیٰ اللّئیمَ الشَمسْ والقَمَرْ بلا تقصیر وكسور

لە کێبەرکـێی‌کێ لە سەرکێ، من و تۆ بوینە سەردەستە، من وتم قیر
تۆ پێڵوی چاوت قونجان و وتت، خۆم و تەفرە و وادەی درۆم لەبیر

من وتم تا رۆژی مردن پەیمانو بەڵێنم لە بیر، تا وتت قیر
تۆ لە نۆبەی خۆتا وتت لە لای من قیر و سیایە بیری فەقیر

وا لرفەی لافاوی درۆ رای مالیوم، مەڵێ بۆ کوێ؟! چون نازانم
بە دەم گورمی شەپۆلی حۆلی تەفرەوە، تەفر و تووناو سەرگەردانم

گەرای گەرووم هەتا دەبوونە یەک وشەی زیت و بزێو، لە لێوی لێو
لێوی رقیان لێم دەکورۆشت، نێر و مێوی دێوەزمە و جنۆکە و خێو

مەگەر ئەوەی نەبێ دەبوون بە چەپکە گوڵە سلاوێ، پێشکەش بە تۆ
تاوانێکم نەبوو تاوا، ببمە باجی بەر سمێڵی خێڵی درۆ

چرای دڵمم گرت بە دەستۆ، ناخی پێکەنینی درۆم بۆ خنکانی
پەنجەی شیعرم، لە سەر نۆتی کام مۆسیقا ڕەوانتر بوو بۆ بزوانی

وەک ئاوازە بە سۆزەکەی سەی عەلیەسغەر، گۆلاوی سافی گۆرانیم
هەڵڕژاندە بەحری ڕەشی نەشڵەقاوی چاوەکانت، هەتا توانیم

کەچی کەفی دەستی لالانەوەم، پڕ بوو لە کەفی سابوونێکی لووس
ماسی خزی پووڵەکاوی بەزەییتی بۆ نەگیرا، بە چارەنووس

لە لای لیئۆناردۆی دڵم، بزەی سیحراوی ژیگۆندی ئەوینم بووی
دەست و پەنجەی هونەرمەند و پڕ لە پیتی خەیاڵی هەڵفڕینم بووی

کوێراییم بوو، نەم دەناسیت موونالیزای ناپاکەکان خەویان بەستووی
ئەشکی نەهەنگ قووتی داوی، بێ لوتفێکی گەڕ و بەدفەڕ کولمی گەستووی

بێتوو میکلانژم بێتەسەر جەزی خەرمانی بەسەری، حەزی دڵم
دەڵێ لە عەرزی وێنووسا وەک عیشقی تۆ، بەرێژە و نەبووە حاسڵم

بۆیە ئێستەش هەر پێم خۆشە بسووتم بۆت، لە گوێنی گڕ. دووکەڵ نەکەم
کیژی بەلێن لەبەر چاوی نامەحرەما، وەک تۆ ڕووت و قووتەڵ نەکەم

بۆیە تا بای هاوارێ سووک، دێنە ژووروۆ لە پەنجێرەی دوو گوێمەوە
خەیاڵ بەرەو پیری خەمت سەڵتە قەمچی دەمباو، کەم کەم دەتوێمەوە

پەیتا پەیتا داری دڵەکوتێم دەلەرزێنێو، بەم لاو لادا دەیچەمێنێ
میوەی گەییو کاڵی ئەگەر تاکوو تووکێ، پێوەمابێ دەیتەکێنێ

بۆیە ئێستاکەش حازرم هەر پەیکانێ، هەر نەشتەرێ، بڕوێ لە رێت
بە لێوی خوێنینی دڵم هەڵی چنم، ماچی بکەم لەباتی پێت

ئێستەش ئاشێ بنیتەوە، دەستەئەژنۆ دابنیشی وەک رۆژی رەش
بۆ مۆرە سەنگی ژێر بلۆسکەکەی، گفتت ئەدەم بێ غەلل و غەش

دوو گلێنەی چاوەکانم پێشکەش بکەم بێماتڵی تا پەیمانم
سەر بە مۆر و دەس نەخوردە، هەر بمێنێ بۆ رووسووری لای گەلانم

هەتاو دەرگام لەسەر داخا، مردن سفرەی بانگێشتنم لە بۆ راخا
هەناسە سیم، هەڵماسینێ‌و قەتیس کرێ لە قەفەسەی سینگی ئاخا

هێشتا بە نەرمە بارانی عاسمانی شیعری ئاودێرم تۆ هەر سەوزی
تۆ نەزەرکەردەی هەڵبەستی، سورمەی سەرنجی چاوێکی بێ وەنەوزی

**سەقز ـ خەرمانانی ١٣٧٢ی هەتاوی**

☆ ☆ ☆

# من و شای پەرییان

ئەڵێم ئیتر شیعری بەهار و گوڵ نەڵێم
چاوی چڵکن شۆڕە سوواری وەرزی گوڵی گرمۆڵە کرد،
جا کەوا بوو هەروا چاکە
کولەی سپی
چوڕی شیری هۆدەی هەڵبەستم دابەمۆ
با لە تەرەی سینگا بڕزێن
شەتڵی ئاوات چپە چپی
لە سەردەمی گیان کەنشتام
ژێر چەپۆکەی ئاویلکەی بێ دەسەڵاتیم
وام لە شکا
بە پێپلکەی خەوێ خۆشا کە دەمبینی بەرەو بەهار
سەرکەوتم یا کەوتم هەردوو ئەژنۆم شکا؟
ئەڵێم ئیتر شیعری بەهار و گوڵ نەڵێم
چونکا لە ژێر پای پاییزا پێ شێل ئەبێ
تاوی هەتاو تاوەتەوە
گەرمای ئەوین سەرما ئەیبا
بەیاخی سوور بە سەر لووتکەی رمی زبەرجەدینەوە
شیتاڵ، شیتاڵ

بای بێ‌وادە هەروا ئەیبا
مانگی نیسانی جوامێری، بەهاری پیتۆڵەکانی کوردستانم
ئەگەر گولاو نەبارێنێ
رەشەباکانی خەزەڵوەر بێتە وێزەی هەورەکانی و
تاسەی دڵی کچی خنجیلانەی، خونچەم بۆ نەشکێنێ
ئەڵێم ئیتر شیعری بەهار و گوڵ نەڵێم
هەوڵی چی بەم هەڵەداوان
بۆ گوڵ وشەی پاراوو جوان
رستەی نەزۆک نەبێ نازێ
زەوقی تێکچووم
بە چنگی غەم روومەتی شیعرم رنیووە
بۆ پرپۆڵەی پەڕەسیلکەی کۆسپی کەوتووم
لە باغچەی بەهەشتی عەشقا
شای پەرییان ئەیوت، بە هەنیسک و گریانەوە
لەسەر لێوی حەمدی هەژار، مانگ و ئەستێرەی بێ‌ژمار
بەرەو مەغرب بریانەوە
ئەیوت هۆ هۆ سووارە عەودالەکە،
سەرتاپا بالاّ پێوانەی پەیامی نوور
مەجدی کەلامت رێک‌تر و جوان‌تر
لە نەمامی وەجدو سروور
بۆ خوار و ژوور
چونکا هەزار هەزار مەلی هیوا

لە هێلانەی بیر و راتا کەوتە تەنوور
ئەڵێم ئیتر شیعری بەهار و گوڵ نەڵێم
ئەیوت ئەی سیروانە پاک و رووناکەکەم
ئەی چۆڵەمەی قەفەسی سینگ
سووتاوەکەی بەژنی گزینگ
ئەی ئاوێنەی تەواو نوێن
ئەی شارەزای رێباز و شوێن
لەبەر ئەوەی کۆچی دوایی هەڵی لووشای
بەهەشتی خوا عاشقت بوو، قەشمەرانە دەسی گووشای
وەخەنجەری بەجێمانی نەشمیلەکەت چوو بە لەشما
پەردە کێشیا بە سەر خەڵکی دیەی گەشما
ئەڵێم ئیتر شیعری بەهار و گوڵ نەڵێم
ئەیوت کاتێ مێرگولانی سرتەی خۆزگەدیلەکانم
قژ بە مەچەکی کەنیشکی حەزی ئەوین شانە نەکەن
مێشەنگوێنە تەراکانی هەنگانی سینگم
لە شیلەی گوڵی باغی میکائیلا ئیتر زەڕین شانە نەکەن
پۆلەکچی گرشەی هەتاو
لەگەڵ شانۆگەریەکانی کوڕی تۆفی دەروون برژاو
بە مانگی سەر پەنجەکانیان
روومەتی چلەی زستانی کۆچی دڵدارم بڕنن
لەسەر سەحنی برینی بەرینا
چەپک چەپک گوڵی گرین

لە رۆخی جۆگەلەی دەمارم بچنن
لەسەر ژێتاری تاری شەوەزەنگ، هەوای شیوەن سەما بکەن
زێوی سەهۆڵ بە بەرۆکو  یێخەی هەناسەما بکەن
ئەڵێم ئیتر شیعری بەهار و گوڵ نەڵێم
ئەیوت ئەوین چەشنی لەولاو
دەگەڕا لە دەور و بەری، دارەبەرێ
پۆپەی لقە سەوزەکانی دابووی لە سەرمیچی عەرش
بۆ عەرش ببوە سێبەرێ
وەلێ کوێربم بە تەنافی رەگەکانی بە بەرچاوی چوار چراوە
ئەوین لە نێو ماڵی دڵیا درا لە دار
وەرزی بەهار وەکوو پێرار و پار پێرار
شەرا بردیو  ئاگر بەربووە خەرمان و دەغڵی هەژار
وەختێ گوڵجاڕی هەڵبەستم رەشی رەش و
بۆ کفنی تەرمی خۆر نەبێ
لە شیعری چارە رەش پتر هیچێکی دیم بۆ جۆر نەبێ
منیش ئەڵێم وەکوو ئەو شاعیرەی ئەڵێ:
وەختێ پاییزی لێواولێو لە رووتەڵی و
بیرەوەری گەلای زەردی بە جێماوبم
لە پۆلی پەریەسەوزە باڵەکانی مێرغوزار لێسووتابم
وەختێ شنەی هەوای بەهار، بە شەو بارانی ئاوەنگی لێ نەچۆڕێ
زوڵف و خەتو خاڵی گوڵ و گیایی کەژو چیام بۆ نەشۆرێ
ئەڵێم ئیتر شیعری بەهار و گوڵ نەڵێم

کاتێ دیوانی هەڵبەستم
لەو ڕۆژەیدا بناوانەی چەمی چاوی لێ هەڵبەستم
هەر لەوێوە
سەر دێڕی قەسیدەکانی، کانی شیوەن بێت و ماتەم
ڕەش تر لە شیوەنی شەوی شایی لێ شێواوی
دڵی سووتاوی گەلەکەم
کاتێ دیانە ریکەی ڕق و کینە
شاگەشکەی ساوا منالی بێدەغێڵەم کاتە گریان
بەحری شکۆم بێ بە سەهۆڵ
بە هەناسەی سەردی زستان و بای زریان
کاتێ تەم و مژی کەسەر،
لە عاسمانی لەجەری چارەنووسمدا نەرەوێتۆ
پەڵە هەورێ لە نەتەوەی ناڵە و هانا
قورس وەکوو تەرمی ڕۆسەم
لەسەر سینەم بحەوێتۆ
کاتێ دەرکی شارەکەمان لە تیشکی نوور داخرابێ
بلوێری زەردی تەلاّیی لە لێوی خۆرا شکا بێ
ماچی کچی قسەی جوان و نەرم و نۆڵ
ببێ بە بەردی سەخت و سڕ چەشنی سەهۆڵ
ئەڵێم ئیتر شیعری بەهار و گوڵ نەڵێم

* * *

لێرەدا بوو ئیتر خۆمم بۆ نەگیرا

چپانمەگویێ شای پەریانا
کە شیعر کتێوی ژینە
نووسەر خوێنی رەگی گەلە
لە نەمان و دوایی هاتن، تەلەسمە و دەوری پەرژینە
بلیمەتێ تۆفانی شیعر و پەخشانی هەڵساندووە
بەرلە هەموو شتێ، مەرگی بە سێدارەی
ئەوین و باوەڕ و هیوا خنکاندووە
کەوا بوو من هەتا ماوم شیعری بەهار و گوڵ ئەڵێم
ئەبوو عەلی سینام بینی
میداڵی زێڕینی پێ بوو لەگەڵ تەبەقێکی نوورا
بەسەرنجێ دووپاتەوە
بە ناو گەلی تورک و تات و فارس و کوردا رادەبوورا
لە کوتوپڕا دڵدارەکەی پەیدا کردی
بەر لە هەموو شت هاوردی
دەسی گرد و بردی بردی
بردی بۆ شوێن و مەڵبەندێ کوردی
جا نوورەکەی کردە سەریا و میداڵەکەی دا لە شانی
ئیتر ئەویش وەک بوو عەلی گڕی تێچوو
بوو بە مەشخەڵێکی نوورین هەموو گیانی
کاتێ کیژۆڵەیێ کراس کرێشە و هەورێشم، بێتە وتار
بڵێ کە چەند فریشتەی سپی پۆش
دەریان هێنا دڵی پیاوێ خاوەنی بەڵێن و بڕیار

ئەمجا برديان بۆ مووزەی بەهەشت و تالاری هەمیشە بەهار
تا لەگەڵ رۆحی دارەناجیلەکانی گەردەن بە خوێن
ببن بە تەزوێحێکی هۆنراوە
بە تای زۆڵفی کچە بەفرینەکانی سەر بەگوێن
با بەهەشتیان لەسەر بەرماڵی مانگەشەو
هەر سوبحانەڵلای ئازادی پێ بژمێرن
بە ئازادیش تەڕکردنی دەمی وشکی زەریاکانی
ئەم سەردەمەیە بسپێرن
زووانی شیعرم ئا بەم جۆرە هەوالانە
هەرگیز لاڵ و پەکەر نابێ،
جا کەوا بێ
هەتا ماوم شیعری بەهار و گوڵ ئەڵێم
کەسێ بۆ مەم شەمێ وەک خاتووزینی مارە بڕیبێ
هەر بە شیعر، جل و بەرگ و گوڵ و گووارەو
مێخەکبەنی بۆ کڕیبێ
کە تا ئێستاش بە لێزمەی بارانی نووری سەوز و کالاً
بەڕینگاڵی پرچی زەرد و گەش و ئالاً
لەبەر شنەی بای شەمالاً
ئەوین ئەو مارەنامە پیرۆزەی
لە بەر حەوش و دەرکی مالاً، کردبێتە درۆشم و ئالاً
لە ژێر شانی چەپی بەکرە شۆفارێکا
دەرەی کینەی خستبێتە ژێر چاوەدێری شیعرو

هەپروون هەپرروونی گۆپالاّ
تا نەسیمی بزەی هەورێشمین بخشێ
بەسەر خەدد و خەت و خالاّ
منیش بۆ جۆر بوونی مەتا و نەخشی کالاّ
هەتا ماوم شیعری بەهار و گوڵ ئەڵێم
شوانێ هەوانەکەی پڕ بێ لە رسق و نان
وەک سفرەی حەزرەت سولەیمان
پڕ بێ لە ژین، پڕ بێ لە مان
پڕ لە دین و پڕ لە ئیمان،
پڕ لە وشەی رەسەن و جوان
لە چەشنی ناموسی پاکی مەستوورەخانی ئەردەڵان
بەرز وەک شاخی هەورامان،
چوارباغی پێنجوێنی قانع
وەکوو تەعریفی ئەبووبەکری موسەننیف
بێعەیب و جامع و مانع
چەشنی وتاری بای سەبا بێبژار و ساف و خاوێن
تێپەڕ بووی رێگەی رۆشنی
بۆ ژوانی پەیمان و بەڵێن
وەک ناڵەی جودایی هێمن، پڕ لە تاسەی کوردەواری
بەهارێ پڕ پڕ لە کانی،
پڕ لە عەتر و هەوای بێخەوش،
دەشت و چیا و مێرغوزاری

تریفه تریفی واژەکانی هەرچی هەواتاریک‌تر بێ
سپی‌تر وەکوو شەونما
شۆراو بە ئاوی زەمزەم‌و، دەم لە ناو دەمی شەونما
چما جامی بەربووکی گردوون هەڵگرن
ئەم وشانە و خاوەنی ئەم بەرهەمانە قەت نامرن
پەس تۆش لەگەڵ مندا رابێ
چۆنکە وابێ هەتا ماوم شیعری بەهار و گوڵ ئەڵێم
کەسێ تەفسیری قورئانی پیرۆزی خوا و پێغەمبەری
بە سەر مەزرای هیوامانا
داکا بە تاو بارەو بەری
بزە بخاتە سەر لێوی چزی تەفسیری خەم کردوو
نهێنی‌تر لە چاودێری ساواییێکی دایک مردوو
ماندوو دەرکەر بێ،
لە جەستەی فەلای خەرمان لافاو بردوو
چەشنی تەرانەی هەزاران، لەسەر باڵی مەلی باران
بڕژێتە سەر مەزرای چڵو
گڵی ملو گوڵو دڵی، کوردو گۆران
بکا تەفسیری نوور و نوون،
«والقلم و ما یسطرون»
«انما امره اذا اراد شیئاً فیکون،
فسبحان الذی بیده ملکوت کلّ شیء و الیه ترجعون»
بە ئەمری ئەو بوو هەر شتێ نەبوون و بوون

وەیا ئەوانەی بوون و چوون
جا با هەوری ڕەشی دژمن، بچەکێنێ مەمکەی تۆفان
تۆفان هەرگیز بۆی قووت ناچێ قەڵەم و بەرهەمی ئیمان
جا با تاریکی پەنجەی نوور
هەر بکرۆژێ بە کەیفی خۆی
دووکەڵ هەر چەن تێبکۆشێ،
کوڵمی خۆر، قەت ڕەش نابێ بۆی
جا با شەیتانی زەڕپەرست لە ڕەش خەیاڵی باوەڕا
بە پەیڕەوی لە سامری
سوژدە بەرێ لە حاستی گوێرەکەی زەڕا .
ئەمەش بڵێم لە دواییدا بە شای پەریان ؛
ئەگەر هەوەڵ ڕۆژی ژیان
خوڕڕەی فرمێسکی ئاڵم
بە سەرهاتی دەروونی بۆ ئەدرکاندم
بە ئاوی گیا کەکرەی سەبر، بە هیوای بەرهەمێ شیرین
زامە بە تیراوێکانی نەیاری دائەمرکاندم
ئەگەر سروودی کۆچی خۆم لە سۆزی شیوەنی نەیا
لە شمشاڵی غەریبیا گوێ نەدەگرد
لەگەڵ نقارە عاقێقیە باڵ سوورەکانم
کە بە حاڵێکوو دووبەلا، لە سیمەوە نەفەس ئەدەن هەڵم ئەکرد
ئیتر هۆنراوەی زامدارم بە خشڵی خوێ نەدەخەملاَن
سفرەی دڵی برینانم بۆ هەموو کەس نەدەکردۆ هەتا هەرمان

من نامەوێ دوژمن شایەکامی بیا
لەسەر گۆڕی گیانی نوورا بڵێ ئۆخەی لێرە و لەوێ
تا ئەوانەی تانەی چاکی و پاکی ئەدەن
بە ماتەمی فەزڵ و هونەر شادی ئەکەن
چەشنی دمەڵ
با هەر لە ڕێی جەحانما، بێن و بچن
بە ئەسرینم نەگرێ شەمیان
پەس بۆ جەماوەر و گشتی زۆر و کەمیان
هەتا ماوم شیعری بەهار و گوڵ ئەڵێم شیعری بەهار و گوڵ ئەڵێم.

**سەقز خەرمانانی ١٣٧٥ای هەتاوی**

**بە بۆنەی کۆنگەرەی فەرزانەکانی کوردەوە کە لە شاری سنەدا بەڕێوە برا.**

# راوی وشه

هـەر چـەن وشـە شـاخە مـارەو دەڕوێ لە نـێو گـۆمی ژارا

هــێشتا دیـلی داوی راوچـی زەوقـی مـنە لە ئەشعارا

تـۆپی ئـەستێرە بـێ‌وشە، لە بـێشکەی ئـاسمانی شـینا

بـۆ هـۆنراوەم دەشـنێتەوە لەسـەر مـەوجی پـێکەنینا

یا خـۆ وشـە ژوورتـریش بـێ لە کـاکێشان، لە مـوشتەری

پـاپۆڕی دەسکـاری شـیعری جـوان، دەنـێرمە سـەری

وەک مسـقاڵە زەرە، وشـە وردیـلە بـێ، پـەیکی هـەواڵ

پەیدای نـەکـا، زەڕڕەبـینی دیـدەی ئـەوین تـیا دەکـا مـاڵ

هـەرچـەن وشـە، تـاقانە مـاسی‌یێکی بەحری بـێ بـن بـێ

پەیتا پەیتا خۆی وەشارێ، باوەگـەورەی سـەغری جـن بـێ

هەر پووڵەکەیەکی رەمزێ، بۆ قـایم بـوون لە تـۆ و مـن بـێ

دەبـێ بـۆ چـەشەی قـوللابی هـەڵبەستەکـانم نـەوسن بـێ

لە نـێو دڵـی تـاڵە مـووێ، سـەد را نـاسک‌تر لە خـەیاڵ

قـایم بـبێ وشـە، هـێشتا دەیـدۆزێتۆ سـێحری حـەلاڵ

بـەڵام هـەموو وشـەیێ نـە، وشـەی بە بـایەخ و تـەواو

تەلای دەسـەو شـار بێ چـمان، لە بـاسکی زێـڕینی هـەتاو

شەپۆل شەپۆل، تیشکی زەردو سووری تازە زاخاودراو
بخاتە ڕێ، بات لە پەڕەی دڵ و بسێنێ ئاو لە چاو

ڕووبارێ بێ خوڕ و ڕەوان، ئاو هەڵدێرێ کەوان کەوان
نەک ڕاوەستاو چەشنی زناو، گەڕ خۆی تیا بشواتۆ شەوان

گەوهەری شەو چرا چۆنە، ئاوا پرشنگ بدا لە دوور
ورشە ورشی بە جۆرێ بێ، وەک تەقی بێتۆ کێوی نوور

تیشکی خۆر بێ، بزێتە ناو دەمی شەونم لە پاکیدا
دەشتی عەتری بەهار تۆزی پای نەشکێنێ لە چاکیدا

ملوانکەییک بێ هۆنراوە، پڕ لە مووروووی سەوزی نەجات
بکرێتە مل کیژی هیوا، ئەویندارێ کوڕی خەبات

پەڕی پەری لە ژوور سەر بێ، خێو دەستی لێ نەوەشێنێ
پەنگاوی بزەی شیرین بێ، فەرهادی دڵ دمی لێنێ

لەنجە و لاری بای بەیانی ناوەڕاس مانگی بەهار بێ
گوڵ دەمی بۆ ئاوەڵا کا، ئالای زەردو سووری یار بێ

بەڵام هەموو وشەیێ نە، وشەی ڕەسەن وەکوو باوەڕ
حوباب نەبێ بمرێ بە فوو، کۆشکێ بێ لە بەردی مەڕ مەڕ

هاوەڵی نیوە ڕێ نەبێ، هەتا ئاکام هەر لەگەڵ بێ
هەتاو چۆنە هەر وا هەڵبێ، تا تاریکی لە بەر هەڵبێ

تەمبەڵ و دەم هەراش نەبێ، هێواش هێواش هێواش دەبێ
وەک شەم بسووتێ بۆ هەژار، (کۆلیل)ێکی تاقانە بێ
راوی کۆتری شەرەف نەکا بۆ خوێنخۆرانی بێ‌قامووس
پەردەی حەیا نەدڕێ تەواو، چارەی بکا بە چارەنووس

بەڵام هەموو وشەیێ نە، وشەی خوێنینی نەرمە بڕ
پشتی شمشێر بە بێ‌دەنگێ بشکێنێ، نەک سمڕ سمڕ

خوێنێکی وا لە بەر دەرکی عیشقا قڵمۆ بوو بێ لە دڵ
خوێن رێژەکانی حیرفەیی و گەڵ کوژەکان لێی بکەن سڵ

بینیتە مل تەوقی زاڵم دووکەرتی کا، پۆلا بڕ بێ
مەرەک مەرەک بەرەک بگرێ بە شەڕ، لە گەڕ دڵی پڕ بێ

شەلاقێ بێ لە دارە مێو، لە دارە توو، دارە بناو
ئاگری کسپە بخاتە ناو لەشی پوواوی ناحەساو

چەپلاخەی بای سەرد و توندی رێبەندان بێ‌لە نیوە شەو
خوێن بزێتە جێ پەنجەکان، سوورۆ بێ وەک دەنووکی کەو

بۆ راپەڕاندنی شۆڕش پڕ بێ لە واتەی هەست و تین
دەس بنێتە بینە قاقای وسکوت و کوڕنووش و چەمین

لە نێو دەستی ئیبراهیمی حەقفا تەورێکی دەم رەق بێ
خودای چێوی لەت و پار کا، یاسای نەمروودیان لەق بێ

رووباری نیلی رێدەر بێ بە هاروون و مووسای کەلیم
بە سەر فیرعەونی ناپاکا بخرۆشێ؛ (کالطود العظیم)

بەلاّ بێ (روخ) بدا لە نێو نووکی باڵندەی ئەبابیل
قەلاچۆ ببڕێ لە (شاه)و (وەزیر)و (سوواره)و (ئەسپ)و (فیل)

کوورەی رقی دڵی کاوەی ئاسنگەر بێ، بە هێزی گڕ
بتاوێنێتۆ هەر سەرێ، پڕ بێ لە مێشکی قات و قڕ

تا رادەیێ حەق بە دەس بێ، ئەگەر کوژرا هەر وەک(میتیس)
پەیکەرەی تۆڵە ئەستێن بێ لە قاتڵی دەس و دڵ پیس

ئەمجا ئەم وشانە هەموو، لەسەر گۆڕی دژمنی نوور
هەڵپەڕکێ کەن، کێ بەر کێ کەن، بۆ ئازادی تا نەفخی سوور

**سەقز رێبەندانی ١٣٦٧ی هەتاوی**

## ئەم بەرهە مانە لە نووسەری ئەم کتێبە چاپ وبڵاو کراوەتەوە

١)لە هەرچیمەنێ،دیمەنێ
٢)دوو بەیتییەکانی(کۆلیل)
٣)ئە سرینی ئاڵ
٤)بەهاری شەستوشەش
٥)چاوی خوێنینی شەوە ق

## ئەم بەرهەمانەش چاپ نەکراون

١)ئاوایە بە زمی عاشقان    وەرگیراولە(یۆسف وزلێخای جامی)
٢)وەرگێڕانی قەسیدە عارەبییەکانی سەعدی
٣)فەرهەنگی گژ وگیا
٤)خاك وخۆڵ ،یانوختە ،خەتیکی تر
٥)کۆکردنەوەی هەندێ چیرۆکی کوردی،بە لێکۆڵینە وە  **(نێوم نەناوە)**
٦)بیرە وەرییە کانی (کۆلیل)

